# هونەری

# سەرکردایەتیکردن

**باڵاترین هونەری سەرکردایەتیکردن و**
**بەهێزترین ڕێگای کاریگەرێتی لە ژیاننامەی**
**مەزنترین سەرکردە ( پێغەمبەری خودا )**

نووسینی: سلیمان بن عوض قیمان

وەرگێڕانی: تۆفیق کەریم

# هونەری
# سەرکردایەتیکردن

........................................................................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ
ژمارە (١٤)

- نووسینی: سلیمان بن عوض قیمان
- وەرگێڕانی: تۆفیق کەریم
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (     )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوەرۆك

## بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس‌و ستایش بۆ خودایەك کە ئاینێکی ڕێك‌و ڕاستی بۆ ناردووین و ئێمەشی خستووەتە سەری و بەناز و نیعمەتی خۆی داپۆشیوین.
سەلام‌و درووودیش بۆ سەر پێغەمبەری نازدار و ڕێنمونیکار.

لەناو خەڵکدا وا باوە کە لە دوای ناخۆشی خۆشی دێت و ئەوی بەشەڕی دەزانێت ئەنجامەکەی خێرە، منیش وادەبینم ئەو هەڵمەتە شەڕانگێزییەی کرایە سەر سەروەری مرۆڤایەتی موحەممەد پێغەمبەر، ئاگادارکردنەوەیەکی خودایی بوو بۆ ئوممەتەکەی تا سەرلەنوێ بگەڕێتەوە سەر لێکۆڵینەوە لە ژیانی و مانای ئیمانی و پەروەردەیی و فیکری و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لێوە هەڵبهێنجێنن، کە پێغەمبەری خۆشەویست کامڵترین بەرجەستەکاریان بوو، بەمەش هەست‌و سۆزی باوەڕداران بۆ ئەو خۆشەویستە قووڵتر و ریشەداکوتراوتر دەبێت.

ئەم نووسینەی بەردەستیشت مەڵۆیەکە لەو خەرمانە بەرەکەتدارە، ئەم کتێبە خولێکی ڕاهێنانە لەسەر هونەری سەرکردایەتی و کاریگەریی، شێوەکانی چارەسەری کێشە، توانای سەرکردەیی کردن و کۆکردنەوەی تاکەکان، بنەماکانی دامەزراندنی خێزان، بەرنامەی پەروەردەی منداڵ و نەوجەوانان، پێویستی بە کاتی زۆر نییە، بەڵکو بە جوانترین و ڕوونترین وێنە و نموونە هاتووەتە بەردەستت.

بەشەكانی ئەم كتێبە پوختەیەكە لە نموونەی سەركردایەتییكردن و نهێنییەكانی جڵەوگرتنی دڵو دەروونو ژیریی لە ژیانی مەردێكی مەیداندا.

زۆر كەس ژیانی مەزنەكانیان نووسیوەتەوە، كەچی موحەممەد (ﷺ) مەزنترینیان دەرچوو، لە ژیانی ئەم سەركردەماندا (ﷺ) هێزێك هەیە پێویستە بە نەرمی بە ناخیدا رۆچین، كۆمەڵێك نهێنی تێدان شایستەی سەرنجدانێكی وردن، ئەمە ژیانی یەكەم مەرد، یەكەم سەركردە، یەكەم مامۆستا، یەكەم پەروەردەكارە.

ئەم پێشەوایە جوانییەكانی لە خۆیدا كۆكردەوە و گەشتە لوتكەیان، هەرچی چاكەیە لە خۆیدا بەرجەستەی كردن گەشتە چڵەپۆپەیان، بوو بە سەرقافڵەی باشی و پاسەوانی ستایشكراو و ئەو پیاوە سەروەری ئادەمیزاد[1] موحەممەدە (ﷺ).

جا كە حاڵەتەكە ئاوەها بێت، دەبێت ئەو رستەو دارشتنە چۆن برازێنرێتەوە كە مەزنی و جوانییەكانی كاروانی ژیانی موحەممەدی مرۆڤ و موحەممەدی پێشەوای تیایاندا دەركەوێت؟

سەركردایەتییكردن كێشەی سەردەمە و كلیلی سەركەوتنە

---

[1] من سەروەری نەوەكانی ئادەمم لە رۆژی قیامەتتدا، یەكەم كەسیشم كە گۆڕم بۆ دەقڵیشێت، یەكەم تكاركاریشم و تكام وەرگیراوە. أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل ـ باب تفضيل نبينا (صلى الله عليه وسلم) على جميع الخلائق، عن أبي هريرة، حديث رقم/٤٢٣٩.

ئەمڕۆ مەسەلەی سەرکردایەتیی دەبێت سەری هەموو مەسەلەکانی دیکەی گەلانی موسڵمان بن، کە دەیانەوێت لە پێشەوەی گەلانی دیکەوە بن.

چونکە ئەو پێشەنگییەی گەلانی دیکە بەدەستیان هێناوە بلێسەیەکە لە چالاکی و رووناکییەکە لە ژیان کە سەرکردەیەك پشکۆکەی گەشکردووەتەوە و تاکێك جلەوەکەی لەدەستگرتووە و مرۆڤێك مەشخەڵانەکەی هەڵکردووە.

ئەمڕۆ گەلانی موسڵمان گرفتی کەمی هێزی مرۆیی و سەرچاوەی سروشتی نییە، تا لەناو گەلاندا پێگەی خۆی وەرگرێتەوە، بەپێچەوانەوە دەوڵەمەندە بە پیاو، ژن، گەنج، منداڵ، گەورە، کە هۆشیارن و حەزیان لەپێشەوە چوونە و خاوەن پلانن و ورە بەرزن و ئامادەشن چیان هەیە بیبەخشن و هەموو تەمەنیشیان لە پێناوی ئەو ئامانجەدا بەخت بکەن.

ئەوی ئاتاجیەتی سەرکردەیەکە تا پێشەنگێتی سەرکردەکانی دیکە بکات بەرەوپێشەوە، سەرکردەگەلێك لە دڵەوە سەرکردە بن، بە رەفتار سەرکردە بن، خاوەنی ئیرادە و هیممەتی سەرکردایەتییکردن بن، جا ئەگەر گەلانی موسڵمان دەرك بە بایەخی مەزنی پێگەشتنی سەرکردەیەکی لەو شێوە ناکەن، ئەوا نەیارانیان دەیزانن و ناهێڵن سیمبولێك یان سەرکردەیەك هەڵبکەوێت بۆ گۆڕینی هاوکێشەکە یان لاسەنگکردنی بە بەرژەوەندی گەلانی موسڵمان، کە ئەوان بە مەترسی راستەقینەی سەر شارستانیەتە داڕزیوەکەی خۆیانی دەزانن ﴿يَعْلَمُونَ

ظَاهِراً مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾ (الروم : ٧)، ئەو نەیارانە ئەوندە هۆشیار و بەئاگان، ریشەکێشی تۆوی هەر کردەیەك دەکەن کە بزانن دەبێتە ئالآهەلگر و داگیرسێنەری مەشخەڵان.

بۆیە ئەمڕۆ ئەرکی سەرەکی هەر تاکێکی موسڵمان و کۆمەڵگەش، هەوڵدانە بە هەموو هێزێك بۆ پێگەیاندنی ئەو سەرکردانە، دەبێت زەمینە بسازێن بۆ دەرکەوتنیان و رێگای خۆسازدان و پێگەیاندنیان بۆ ئاسان بکرێت، پاش ئەوەش پارێزگارییان لێ بکرێت بەوەی لە توانادا هەیە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئیمانو پشت بەخوا بەستنی بە تەواوی مانا تێدا بەرجەستە بووبوو، کەچی پاسەوانی بۆ خۆی دانابوو، زۆر هەوڵی لەناوبردنیشی درا، بەڵام پەروەردگار پەردەی لەسەر هەندێکیان دادەماڵی و بە هەندێکیشیان ئیرادەی خێری هەبوو، کە دەبووە هۆی باوەڕهێنانیان، پێغەمبەری خوا دەستی لە پاسەوانەکان هەڵنەگرت تا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائدة: ٦٧)، ناشبێت دانیشین و چاوەڕێی بەدیهاتنی مژدەکەی پێغەمبەری خوا بین: (پەروەردگار لەسەری هەموو سەد ساڵێکدا کەسێك دەنێریت بۆ ئەم ئوممەتە تا ئاینەکەی بۆ نوێ بکاتەوە).

بەڵکو پێویستە لەسەر هەر خاوەن رایەکی جوان یان خامەیەکی بە بڕشت یان خاوەن بیرێکی پێگەیشتوو، ئەوەی لەدەستی دێت بیکات لەو پێناوەدا، ئەمەی بەردەستیشت بەشداربوونی بەندەیەکی خودایە لەو پێناوەدا ﴿وَاللّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف: ٢١).

# ئەم كتێبە چۆن دەخوێنیتەوە

١ـ هەركاتێك ناوی پێغەمبەر هات (ﷺ) سەڵاواتی لەسەر بدە، (لوتی بسۆڵێتەوە پیاوێك ناوی منی لا هێنراو سەڵاواتم لەسەر نەدات)[1].

بۆیە دەڵێین: (اللهم صلی علی محمد وأزواجه وذریته كما صلیت علی إبراهیم، وبارك علی محمد وأزواجه وذریته كما باركت علی إبراهیم إنك حمیدٌ مجید).

٢ـ ئەم بابەتانەی بەردەستت شارێگەیەكی كۆمەڵییە بۆ خوێندنەوەی هەڵوێستەكان و لێدەرچوونیان بە دیدی جیاجیاوە بۆ هەر دەقێك، با هەر خوێنەرێك بە تێبینی و سەرنجی خۆی بەشدار بێت بۆ شكاندنی ئەم دۆخە چەقبەستووەی تێیكەوتووین.

٣ـ ئەگەر لە خوێندنەوەی ئەم بابەتانە هەر خێری سەڵاواتدانەكەت دەست بكەوێت بەسە، چونكە خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت: (هەركەسێك یەك سەڵاواتم لەسەر بدات، خودا دە سەڵاواتی لەسەر دەدات و دە گوناهی دەسڕێتەوە).

خوێنەری بەڕێز:

ئەم كتێبەی بەردەستت خوێندنەوەیەكە بۆ سیمبولێتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەركردایەتیی كردن و كاریگەریی و پەروەردە و ئاراستەدا.

---

[1] سندە صحیح

## سودمەندان

ئەم کتێبە هەمووان دەتوانن لێی سوودمەند بن، پیاو، ئافرەت، بەڕێوەبەر، وەزیر، بازرگان، بانگخواز، زانا، ڕاگەیاندکار، وانەبێژ، وتاربێژ، گەنج، منداڵ، پیاوی پیری بەساڵاچوو، واتە هەموو مرۆڤێکی زیندوو.

## لەم کتێبەدا چی دەخوێنیتەوە

ئەم نووسراوەی بەردەستت خوێندنەوەیەکی ژیانی پێغەمبەری خوایە و لێکۆڵینەوەیەکە لە ئاکارەکانی، هەروەها کاردانەوە و شێوازی ئاراستە و سەرکردایەتییکردنی، ڕێبازی ئەو لە گۆڕانکاریی و کاریگەرێتییدا، چۆنیەتی بەکارهێنانی تاکو ئیدارەدانی هاوەڵانی و قوڵکردنەوەی گیانی گەلکاری، هەرچەندە زمانپاراوترین کەس بوو، بەڵام ئەمانە لە قسەکانیەوە نا، بەڵکو هەڵوێستگەلێك کە ڕاستەوخۆ خۆی دەینواند و پاڵەوانەکەی بوو.

## ڕووناکی بەسەرهات

ئەم کتێبە بە چیرۆك ڕووناککراەتەوە لەتەك ڕووناکی ڕێنمایی و سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆیە بووەتە ڕووناکی لەسەر ڕووناکی، هیدایەتی زیاتر، جوانیەکی دڵڕفێن، کە خوێنەر تێر نابێت لە خوێندنەوەی، لەبەر ڕەزینی و ڕەسەنی شۆڕەسوارەکەی (ﷺ)، وشەکان دەبریقێنەوە و ڕستەکانیش پرشنگ دەدەن لەبەر کاریگەریی ڕەفتار و سیفەتە پرشنگدارەکانی ئەو. ئەمە کاروانی مەزنترین مرۆڤێکە پێی خستبێتە سەر زەوی، ژیانی بووەتە میسکو گوڵاو و بۆ هەر کەسێکە حەزی لە بۆنی خۆشە، ڕووناکییەکە هەموو ڕێبوارێك دڵخۆش دەکات، کانییەکە تینووەکان تینوو دەشکێنێت.

## نویٚ لەم کتێبەدا

ئەم کتێبە وێنەیەکی نویٚ و قاڵبێکی جیاوازە لەوەی خەڵکی لەسەری راهاتوون سەبارەت بە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە ئەم گێڕانەوەی ژیانی نییە بەپێی خشتەی زەمەنی یان کۆکردنەوەی شەڕ و غەزاکانی نییە، هەروەها پەند و سوود هەڵێنجان نییە لە ڕووداوەکانی سیرەت.

بەڵکو ئەم کتێبە کۆکردنەوەی کۆمەڵە هەڵوێستێکە کە نزیکن لەیەك ماناوە، بۆ هەڵوێستەکانیش رستەیەکم بەکارهێناوە کە مانای ناواخنەکانیان بێتو ناونیشانێکم نووسیوە کۆیانکاتەوە، لە گێڕانەوەیەوەکی چیرۆك ئامێزدا و بە شلکردنی جڵەوی قەڵەم بۆ دۆزینەوەی هەر وشەیەکی گەش و قەشەنگ، بەڵام ئەمانە هەموو یەك بابەتن ئەویش بابەتی سەرکردایەتی و کاریگەریەتی لە ژیانی سەروەری هەموو سەرکردەکان و کاریگەرترین مرۆڤ.

## ڕێکخستنی بەشەکانی ئەم کتێبە

سەرەتای هەموو بەشێکی ئەم کتێبە بەناونیشانێك دەستپێکردووە، پاشان دەقە سەرەکییەکەم هێناوە لەگەڵ خوێندنەوەیەکی ئەدەبی فیکریدا، دوای ئەوە چەند وێستگەیەکی دیکەم هێناون، کە مەبەستەکە روون دەکاتەوە و پشتیوانی مانای ڕووداوەکەیە، لە کۆتایی هەموو بەشێکیشدا گەوهەرێك جێگیر دەکەم کە ناسکترین نموونە و جوانترین وتە بێتو ئایەتێکیش دەهێنمەوە کە نهێنییەك لە نهێنییەکانی سەرکردایەتی بیردەخاتەوە.

**بۆیە بەم شێوەیە بەشەکانم ڕێکخستووە:**

١ـ ژمارەی بەش.

٢ـ ناونیشانێك کە دیدێکی سەرەتایی لەسەر نهێنییەك لە نهێنییەکانی سەرکردایەتی ببەخشێت.

٣ـ دەقی سەرەکی.

٤ـ خوێندنەوەیەکی ئەدەبی و پەروەردەیی و فیکری دەقەکە.

٥ـ هەڵهێنجانی نهێنییەك لە نهێنییەکانی سەرکردایەتییکردن.

٦ـ چەقی نهێنیەکە لە ڕووی دەروونی و ویژدانییەوە.

٧ـ کۆمەڵێك چیرۆك و هەڵوێست کە پشتیوانی ماناکە و مەبەستەکە ڕوونتر بکاتەوە.

٨ـ گەوهەری بەشەکە (چیرۆکێکی ناوازە بە جوانترین شێوە دەربڕدرێت).

٩ـ کۆتایی و یادخستنەوە و ئایەتێکی گونجاو بۆ ئەو شوێنە.

بەو شێوەیە نهێنییەکانی سەرکردایەتیم هەموو لە کۆتایی کتێبەکەدا کۆکردووەتەوە کە ناوم ناوە:

نهێنییەکانی سەرکردایەتی و کاریگەرێتی

بڵندترین هونەری سەرکردایەتییکردن و بەهێزترین ڕێگا لە ژیانی مەزنترین سەرکردەی مرۆڤایەتییدا (ﷺ).

# بەشی یەکەم
# ڕێزلێنان و بایەخ پێدان
# لە فەرهەنگی دەروونی مرۆییدا

حەز بە ستایشکردن و ڕێزلێنان، لە بەهێزترین پاڵنەرەکانی مرۆییە، ئەم پاڵنەرە نهێنییەکی سەرکەوتووی مرۆڤە بەسەر دروستکراوەکانی دیکەدا، بڕبڕەی پشتی بەخشینەکانی مرۆڤە، ئەمە وا لە ئادەمیزاد دەکات ببێتە داهێنەر، شتی نوێ پێشکەش بکات و داخوازی زیاتریشی ببێت.

## پیرەژنێك خزمەتی مزگەوت دەكات

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە (ژنە رەشتاڵەیەك نیشتەجێی مزگەوت بوو، ماوەیەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیبینی، بۆیە پرسیاری كرد، وتیان: مردووە، فەرمووی بۆ ئاگادارتان نەكردم؟ دەڵێت: وەك بڵێیت شتەكەیان بەكەم زانیبوو، جا فەرمووی: گۆڕەكەیم نیشاندەن، پێیان نیشاندا، ئەویش نوێژی لەسەر كرد، پاشان فەرمووی: ئەم (گۆڕ)انە پڕن لە تاریكی بۆ خاوەنەكانیان، پەروەردگار بە هۆی نوێژی منەوە لەسەریان رووناكی دەكاتەوە).

لە ئەبو سەعیدیشەوە دەڵێت: (ژنە رەشەیەك خزمەتی مزگەوتی دەكرد، بە شەوا وەفاتی كرد، بۆ رۆژەكەی هەواڵەكەیاندا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا، فەرمووی: بۆ ئاگادارتان نەكردم؟ جا هەندێك لە هاوەڵانی برد لەسەر گۆڕەكەی وەستا و نوێژی لەسەر كردو خەڵكیش لە پشتییەوە بوون، ئەوجا بۆی پاڕایەوە و پاشان جێیهێشت).[١]

لە ئیبن عەباسەوە ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو ژنەم لە بەهەشتدا دی، كە خاشاكی لە مزگەوت هەڵدەگرت)[٢].

---

[١] سندە صحیح.

[٢] سندە صحیح.

## خوێندنەوەی دەقەکە

هەڵوێستی پێغەمبەری سەرکردە سەبارەت بەم ئافرەتە سادەیە، بایەخێکی گەورە و هەستێکی بەرزی تێدایە.

کەواتە شوێنی ئەم ژنە لە خشتەی کاری کابرایەك کە لە لوتکەی سەرکردایەتی مرۆڤایەتییدا بێت، وەکو موحەممەد (ﷺ) ئەبێت لە کوێدا بێت؟ دەبێت ئاستی هۆشیاری و ئاگایی بیری چەند بێت، تا ئاگای لە دیارنەمانی ژنە پاککەرەوەیەکی مزگەوت هەبێت و هەواڵی بپرسێت؟ چی وایلێکرد رەخنە لە هاوەڵانی بگرێت کە لە نەبوونی ئەودا ناشتوویانە، چی پاڵی پێوەنا لەگەڵ هاوەڵانیدا بچێت و لەسەر گۆڕەکەی نوێژ بکات و بۆی بپاڕێتەوە؟

ئەمەی دەیەوێت دەروونی سەرکردەکانی دیکەی لەسەر رابهێنێت، بۆ سەرکردایەتیکردن لە دوای خۆی بایی چەندە؟

ئەم ژنە بەڕێزە، بۆ شایستەی مژدە پێدانی بەهەشت بوو؟ ئایا کارێکی ئاوها ئاسان لە تەرازووی چاکەدا هێندە مەزنە؟

بەڵێ ئەوە ئافرەتێکە خۆی بە خوا بەخشیوە، خزمەتی ماڵەکەی دەکات و شەو و رۆژ پێوەی خەریکە بەبێ منەت و لاف و گەزافێك، پێغەمبەری سەرکردەش (ﷺ) رۆژانە دێت و دەچێت شوێنەواری ئەو ژنە راساڵە دەبینێت، خاوێنیەك دەروونی نوێژخوێنان هێور دەکاتەوە و دڵیان خۆشدەکات، کەواتە بەڕاستی ئیشێکی پیرۆزە و کەم کەس دەیکات و زۆرێك لە هامەشۆکارانی مزگەوت خۆیانی لێ دەبوێرن.

خوای پەروەردگاریش هەشت دەرگای خستووەتە بەهەشتەکەیەوە تا بەشی کاری هەموو بەندەکانی بکات، بەپێی خولیا و جیاوازی سەرقاڵییان، ئەم ژنەش بە کارێك هەستا لە دەرگا بەرینەکەوە گەیاندیە بەهەشت و بینرا لەوێش هەر خزمەتی مزگەوت دەکات.

بەڵێ ئەوە مردنێکی خۆشو زیندووبوونەوەیەکی خۆشە، چونکە هەموو کەسێك لەسەر ئەوەی دەمرێت زیندوو دەکرێتەوە، ئەم ژنەش کارەکانی بە خزمەتکردنی مزگەوت کۆتایی پێهێنا و دواساتەکانی ژیانی پێ بەخشی.

بەم کارەش شایانی ئەو ستایشەی پێغەمبەری سەرکردە بوو کە مژدەی بەهەشتی پێدا، ئا ئەمە بایەخپێدان و رێزلێنانە، لە ئیمامی ئەو مزگەوتەوە کە خزمەتی دەکرد تێیدا، ئەویش بە کۆکردنەوەی ئەو خەڵکە لەسەر گۆڕەکەی و نوێژ لەسەر کردنی و پاڕانەوە بۆی.

# یەکەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو:
# رێزلێنان و گرنگییدانە بە هەموو کەسێك

**سەنگینی دەروونیی ئەم نهێنییە سەرکردەییە**

حەزکردن لە ستایش‌و پێزانین لە بەهێزترین پاڵنەرەکانی مرۆڤە، یەکێکیشە لە نهێنییەکانی زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر گشت دروستکراوەکانی دیکەدا، بڕبڕەی پشتی بەخشینە مرۆییەکانە، هەر ئەم حەزە مرۆڤ والێدەکات تاکێکی ئافەریدە بێت‌و شتی نوێ دابهێنێت و هەنگاوی زیاتر هەڵنێت مەگەر چی لە گیان شیرینترە؟ کەچی مرۆڤ ئەم سەرمایە نرخدارە هەرزانفرۆشدەکات لەبەر ناو و ناوبانگ و ستایشکردنێکدا.

ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت: (کابرایەك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: کەسێك شەڕ بۆ دەستکەوت بکات، کەسێکیش بۆ ناو و ناوبانگ بیکات، یەکێکی دی بجەنگێت تا جێدەستی ببینرێت، کامیان لە رێگای خودایە؟ فەرمووی: ئەوەی لەبەرئەوەی جەنگا کە ناوی خودا بەرز بکاتەوە، تەنها ئەوە لە رێگای خودایە). کەواتە کەسانێك هەن ژیانیان دەخەنە مەترسییەوە، گیانیان هەڵدەدەنە ناوجەرگەی مەرگەوە، بۆ وا دەکەن؟ بۆ ناو و ناوبانگ و دیاربوونی جێدەستی!

خەڵکانێکیش بە بژاردە و ویستی خۆیان خوێنیان رژاو گیانیان بەخشی لە جەنگەکاندا تا بە ئازایی ناوببرێت و ستایش بکرێت، ئەوەتا لە رۆژی دواییدا بە پەروەردگاری دەڵێت: (لەپێناو تۆدا شەڕمکرد تا

شەهید بووم، پەروەردگاری دەڵێت: درۆ دەکەیت، تۆ بۆ ئەوە شەڕتکرد تا پێت بڵێن ئازایە، دە ئەوەیان پیّ وتی، پاشان فەرمان دەکات بەسەر دەمدا رایدەکێشن تا تووڕ دەدرێتە ئاگرەوە).[1]

ئەم دەرگایەش بە تەنها بۆ موسڵمانان قۆرخ نەکراوە، بەڵکو لە مێژە لە نەوە و گەلانی دیکەشدا پیاوان و ژنانێکی زۆر هەن کە گیانیان بەخشیوە و نەترساون و چوونەتە بەردەم پەتی سێدارە بۆ هەڵواسین تەنها بۆ ناودەرکردن لەبەر حەزکردن لە رێز و پێزانین.

## دەروونەکان و رێز و پێزانینیان

دەروونی مرۆڤ حەزێکی زۆری رێزلێگرتنی هەیە، قورئان لەم بارەوە دەفەرمویێت: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَاباً فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ (الأنبياء: ١٠)، ئیبن کەسیر دەڵێت (ذِكْرُكُمْ) واتە شکۆ و رێزی ئێوە.

لە ژیاننامەی پێغەمبەردا هاتووە (ئێمە و بنەماڵەی عەبدولمەناف ململانێی یەکترمان کرد، نانیان بە حاجیان دا ئێمەش نانمان دا، باری هەژارانیان هەڵگرت ئێمەش هەڵمانگرت، بەخشییان، بەخشییمان، هەتا لە پێشبڕکێکەدا هاوشان وەك دوو ئەسپی غاریی دەڕۆیشتین، کەچی ئەوان دەڵێن: لە ئێمە پێغەمبەرێك هەیە لە ئاسمانەوە وەحی بۆ دێت، ئەی ئێمە کەی دەگەینە شتی وا؟ وەڵڵاهی هەرگیز باوەڕی پێناهێنین و پشتڕاستی ناکەینەوە).[2]

---

[1] اخرجه مسلم في صحيحه عن ابي هريرة رقم ٣٦٣٥

[2] قسەکە هی ئەبوجەهلە سەیری (سیره ابن هشام)بکە ٣١٥/١

## ڕۆژی ڕێزلێنان

ئەو ڕۆژەی کە زۆرینەی دامەزراوەکان دیاری دەکەن بۆ ڕێزلێنانی کرێکارەکانیان ڕۆژێکی زۆر هەستیارە بۆ هەموو کارمەندان و ئەوانەش لەگەڵیاندا مامەڵە دەکەن. بەهای ڕێزگرتن بە نرخی دیاریەکە ناپێورێت، پیاهەڵدانی ڕۆڵێکی بچووکە ـ لەبەرچاوی خەڵکیدا ـ بەڵام لە چاوی خاوەنەکەیدا گەورەیە. با نموونەیەکی دیکەتان لە قورسی ئەم بەها سەرکردەییەتان لە ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشکەش بکەم، کە پێزانینی گونجاو و نرخدانانی شایستە دەبەخشێتە تەنانەت ئەوەی زۆرترین ئازاری داوە و زیانی پێگەیاندووە تەنها بە هاتنە ناو دەروازەی ئاینەوە.

## دوو سەرکردە ناکۆکەکە

لەو مەکەیەی سەروەری مرۆڤایەتی موحەممەد (ﷺ) تیایدا لەدایکبوو، ئەبو سوفیان سەخری کوڕی حەرب، گەورەیەك لە گەورەکانی مەکە بوو، پیاوێکی شکۆدار و سەرگەورەی هۆزەکەی و خاوەن سەروەتو سامان بوو، یەکێك بوو لە ناوداران و پیاوماقووڵە گەورەکانی، کەسێك بوو نکوڵی لە پێگە و ڕێزیدا نەدەکرا و سەرۆکایەتی و پلەشی دڕ نەدەدرا.

کە بانگەوازی نوێ سەریهەڵدا و پێغەمبەری نوێ (ﷺ) کەوتە هاندانی خەڵکی تا لەگەڵی بن و شوێن ئەو ڕووناکییە بکەون، ئەبو سوفیان هەر لە سەرەتاوە لە مەترسیی ئەم بانگەوازە نوێیە گەیشت،

بۆیە لەمپەرێکی ئاشکرای لە دەروونی بەرامبەری دانا، وایدەزانی کپکردنەوە و تێکشکاندنی خێر و سەروەری ئەمە و شکۆ و ماقوولێتی دەمێنێتەوە، بۆیە دژایەتیکردنی پێغەمبەرە نوێکەی (ﷺ) بە توندی دەکرد کە لە ئاست پێگەی خۆیدا بوو لە مەککە. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی لە ئەبوسوفیان و هاوەڵانییەوە سەخترین ئازار و پیسترین جنێو و ئەوپەڕی گاڵتەیان پێ دەکرا.

## رفێنراوەکە

دوای دەرچوونی لە شارەکە خۆشەویستەکەی وماڵەکەی کە دڵڕفێنی بوو، سەرگەورەکانی قورەیش وازیان لە پێغەمبەر (ﷺ) نەدەهێنا تا رێنمایی خەڵك بکات لە دوورگەی عەرەبییدا، لە ماوەی هەشت ساڵدا، ئەبو سوفیان بەشداری شەڕەکانی بەدر و ئوحود و خەندەقی کرد و لە حودەیبیەشدا رێگری کرد، ئینجا فەتحی مەککە هات.

## فەتحکردن

ئیتر ئەمە کۆتاییەکەیە، کە ئەبو سوفیانو سەرگەورەکانی مەککە بینیان وا بانگەوازە نەوزادەکە زنجیری ئابلۆقەدانی پساند و گەشتووەتە هەڕەتی لاوێتی و لەخەمرەخساوە، ئیتر شانشانێنی لەگەڵ ناکرێت، ئەوەتا خەڵکی مەدەینە بە سەروەر و (ﷺ) هاوەڵانییەوە ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ بە رۆژی روون بەرەو مەککە دێن، هیچ پیاوماقوڵ و نەجیبزادەیەك لەبەردەمیاندا ناوەستێت جگە لە چوار دیوارەکەی ماڵە پیرۆزەکەی خوا، هیچ نایانگرێتەوە.

## سەرکردەی مەککە داوای لێبوردن دەکات

دە رۆژ لە مانگی پیرۆزی رەمەزانی هەشتەمساڵی کۆچی تێپەڕیبوو، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە یاوەری دە هەزار هاوەڵیەوە لە مەدینەوە بەرەو مەککە دەرچوو، کاتێك لە (ئەبواء) بوو گەشتنە ئەبو سوفیان و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی پورزای، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتی تێکردن، چونکە ئازار و جنێوی زۆری لەدەست چەشتبوون، کەچی عەلی بە ئەبوسوفیانی وت : بەرەو روو بڕۆرە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و قسەی براکانی یوسفی پێ بڵێ: ﴿قَالُواْ تَاللّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾ (یوسف: ٩١)، چونکە رازی نییە کەس لەو قسەی باشتر بکات، ئەبو سوفیانیش چوو وایکرد، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ﴿قَالَ لاَ تَثْرَيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (یوسف: ٩٢)).[١]

## ئەبوسوفیان کابرایەکە حەزی لە شانازیکردنە

عەباس ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو سوفیان پیاوێکە حەزی لە شانازیکردنە، بەڵکو شتێکی بۆ بکەیت، فەرمووی: باشە، هەرکەس چووەماڵەکەی ئەبوسوفیان پارێزراوە، هەرکەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی داخست پارێزراوە، هەرکەسیش چووە مزگەوتەوە پارێزراوە، دەڵێت: خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد بەرەو

[١] رواه أصحاب السنن عن ابن عباس وحسنه الألباني في تعليقه على فقه السيرة للغزالي، ص٣٧٦.

مزگەوت و ماڵەکانیان.[1] جا توخوا پێمبڵێ مرۆڤ چەند هەست بە شانازی دەکات، کە دەبینێت ماڵەکەی بووەتە نشینگەی پارێزراوی و مۆڵگەی ئاشتی؟ ئەم بەخششە پێغەمبەرایەتیەی لەگەڵ ئەبوسوفیان دەکرێت، تەنها خەڵاتێکی شانازییکردن نییە، بەڵکو رازییکردنی دەروونی کابرایەکە سەرداری هۆزەکەیەتی، کە خەڵکی لەسەر براگەورەیەتی راهاتبوون و دانیان نابوو بە سالارێتیدا، بۆیە دروست نییە کاتێك بە ئیسلام شەرەفمەند دەبێت، ئیسلامبوونەکەی لە پێگە و پایەی نزمبکاتەوە.

## هەر بەڕاستی سەروەری ئادەمیزاد بوو

ئایا گەورەیەك یان فەرماندەیەکتان دیوە ئاوها بێت؟ رەچاوی هەستی دوژمنەکەی دوێنیێ بکات، رازی نەبێت کە ئەو رێگەیەی دەگرنەبەر و بەو ئاینە قایل دەبن ببێتە هۆی دابەزینی پلەوپایەیان و حاڵیان بگۆڕێت. ئەبوسوفیان پلەی سەرگەورەیی و پیاوماقوڵیت پارێزراوە، خانوەکەت دەکرێتە مێرگی ئاشتی و پاراستنی هەرکەسێك تێی بچێت، سەیرکە چۆن ماڵەکەی ئەبوسوفیانی پێش کەعبەی پیرۆز و ماڵی خوا خستووە، لەکاتێکدا هەموو کۆدەنگن کەعبەی پیرۆز پلەبەرزتر و پەنادەرتر بە حورمەتترە لە هەموو ماڵێك.

[1] أخرجه ابو داود في سننه في كتاب الخراج والامارة والفيئ، باب ما جاء في خبر مكة، رقم ٢٦٦٩، عن ابن عباس، وقال هيثمي في المجمع ٢٤٢/٦، رواه الطبراني ورجاله رجال صحيح.

بەڵام ئاینی راستەقینە کە دڵەکان دیل دەکات و هۆشەکان کەمەندکێش دەکات، هەرکەسێك ئاڵوویڵی لەگەڵ کرد دەرباز نابێت نە لە خۆی و نە لە سەرکردە مەزنەکانی هەر دەبێت تەسلیمیان ببێت و دان بە چاکە و بەخشندەییاندا بنێت، چونکە ئەمە ئاینێکە گەشتووەتە ئەوپەڕی سەلیقەیی و رەچاوکردنی هەستو چارەسەری دڵەکان.

## کاریگەریی شانازی پێدان و پیاهەڵدانەکەی پێغەمبەر (ﷺ)

جا ئەبو سوفیان خێرا خۆی گەیاندەوە مەککە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: خەڵکی قورەیش، ئەوا موحەممەد بۆتان هاتووە بەشێوەیەك بەرگەی ناگرن، هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە پارێزراوە، وتیان: خوا بتکوژێت، دەی خانووی تۆمان بۆچییە؟ وتی: ئەوەی دەرگای ماڵی لەسەرخۆی داخست پارێزراوە و ئەوەش بچێتە مزگەوتەوە هەر پارێزراوە. ئیتر خەڵك بۆ مزگەوت و ماڵی خۆیان بڵاوەیان لێکرد، فەتح تەواو بوو لێبوردن زیادی کرد و خەڵکی مەککە پۆل پۆل ئارەزوومەندانە هاتنە ناو ئیسلامەوە.(١)

---

١ بە درێژی سەیری چیرۆکەکە بکە لە (شرح معاني الآثار للطحاوي) ٣/٣٢٠.

## مەزنەکان

ژیانی هەر سەرکردەیەکی مەزن یان گەورەیەکی دلێر بخوێنەوە کە شایستەی ستایش و پیاهەڵدانە، دەبینیت ژیاننامەکەی پڕە لە بایەخدان بەوانەی دەوروبەری و ڕێزی ماندووبوونی گەورە و گچکە دەگرێت، ئەو حەزەی کە لە دەروونی هەموو کەسێکدا هەیە دەهێنێتەدی کە (حەزکردنە لە پێزانین و ستایشکردن) هەموو ئەو مەزنانە بە قوتابیەکی گچکەی قوتابخانەی سەرکردە گەورەکە حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) دەژمێردرێن، بۆیە ژیاننامەی ئەو سەرکردە گەورە (ﷺ) دەریایەکی بێ بنی پڕ لە دووڕو گەوهەرە کە ئاماژەی نهێنییەکن و مایەکی گەورەیان هەیە، ئەوەش دڵۆپێك لەو دەریایە:

## بە قسەو ڕووخسار ڕوویان تێدەکات

عەمری کوڕی عاص دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕوخسار و قسەش ڕوویدەکردە بەدکارکرترینی خەڵك، جا بە ڕوخسار و قسە ڕووی لە منیش دەکرد، تا وامدەزانی من باشترینی خەڵکەکەم، بۆیە وتم ئەی پێغەمبەری خوا من باشترم یان ئەبوبەکر؟ فەرمووی: ئەبوبەکر، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من باشترم یان عومەر؟ فەرمووی: عومەر، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من باشترم یان عوسمان؟ فەرمووی: عوسمان، کە پرسیارم لە پێغەمبەر کرد، ڕاست وەڵامی دامەوە، بۆیە حەزم دەکرد پرسیارم لێ نەکردایە.[1]

[1] أخرجه الترمذي في الشمائل المحمدية، باب ما جاء في خلق رسول الله (ﷺ) حديث رقم ٣٣٥، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ٥٧٥/٨، في الصحيح بعضه بغير سياقه، ورواه الطبراني واسناده حسن.

سەیری ئەو گرنگییە بکە پێغەمبەری خوا بە عەمری کوڕی عاصی دەدا گەیاندیە کوێ؟

بەڵێ بایەخی پێدەدا و زۆر رووی تێدەکرد و بۆی دەگەشایەوە و دەدرەوشانەوە، رێزی لە پێگە و دیداری دەگرت، تا ئەو گرنگی پێدانە ئەوەندە دوور بردی، وایدەزانی ئەو کەوتووەتە پێشی پایەی ئاین و نیوەی ئیسلامەوە کە ئەبوبەکری صدیقە، کە گەورەیی و پێگەی تەواو روون و لەبەرچاو بوو، تەنانەت عەمر خۆی ئەم مانایە لە دەروونیدا چەسپی، لەبەر ئەو گرنگیە مەزنەی پێی درا و ئەو پێشوازییەی کە دەچووە لای پێغەمبەر (ﷺ) لێیدەکرا، پاشان دوای پرسیارەکانی ئەوەی لا هەڵگیرا.

## خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (ئافرەتێك کەمێك عەقڵی ناتەواو بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویستیەکم پێتە، فەرمووی: ئەی دایکی فلانکەس بزانە بۆ کوێت دەوێت تا پێویستییەکەت بۆ جێبەجێ بکەم، ئەویش بەو رێگایانەدا بردی تا پێویستییەکەی تەواو کرد).[1]

ئەمە جاڕدانێکی پێغەمبەرایەتییە بۆ ژنێك عەقڵی ناتەواوە، دەبێت چ کاریگەرییەکی لە سەرخستنی ئاین و دڵدانەوە و پێغەمبەردا هەبێت؟ هیچ!

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل، باب قرب النبي من الناس وتبركهم به برقم ٤٤١٤.

بەڵام ئەم سەرکردە مەزنە (ﷺ) چاوی دەستخستنی بەرژەوەندییەکی خێرا و سوودێکی تایبەت نییە، بەڵکو رایدەگەیەنێت و بڕیار دەدات ئەم پەیامە هاتووە بۆ بەختەوەر کردن و دەروون حەوانەوەی هەموو تاکێکی هەرچیەك بێت، با عەقڵیشی ناتەواو بێت، جا ئایا بیستووتانە یان خوێندووتانەوە یان پێتان گەشتووە هیچ بایەخپێدانێك بە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان هێندە بڵند بێت یان بگاتە ئەو پێگەیە؟!

## رەحمەتە بۆ هەموو جیهانیان

ئایا بیرمانکردووەتەوە لەو بڕیارەی قورئان کە چ سنوورێکی بۆ پەیامەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستنیشانکردووە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ (الأنبياء: ١٠٧)، ئەم چوارچێوەیە، ئاژەڵ و بێ گیان و باڵندە و ئادەمیزادیش دەگرێتەوە، وەڵا پێم سەیرە کەسێك تۆزقاڵێك عەقڵی هەبێت و ئەمە بخوێنێتەوە و سەلاواتی لەسەر نەدا.

## رووبەڕوو

ئەنەس دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە پیاوێك بەرەو رووی دەهات و تەوقەی لەگەڵ دەکرد دەستی لەدەستی نەدەکردەوە تا کابرا دەستی شل دەکرد، روویشی لە رووی وەرنەدەگێڕا تا کابرا رووی لادەدا، نەشبینراوە ئەژنۆکانی لەبەردەم مەجلیسدا پێش بخات)[1].

[1] أخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح، ابوا صفة القيامة والرقائق والورع برقم ٢٥٠٣، وقال حديث غريب، وقال الألباني في تعليقه على السنن، ضعيف، إلا جملة المصافحة فهي ثابتة، ابن ماجة، ٣٧١٦.

جەخت لەوە دەکەمەوە گەر ئێمە ئابەو سەلیقە و زەوقەوە ئیشمان کرد با دەبوین بەسەردار و سەروەر و دەستنیشانکراوی خەڵك.

دەبێت چەند ئارامیت بۆ بێت و خۆشەویستی و کاریگەریت بۆ دروست بێت لەبەردەم سۆز و ڕۆوخساریکی ئاوهادا، ئایا ئەمە بۆ کەسێکی تر کە ڕووی تێ بکەیت ڕوو دەدات؟ کەسێك هەیە ئەو گرنگییەی پێ بدرێت و پێی کاریگەر نەبێت؟!

## گەوهەرێکی موحەممەدی

نەریتی خەڵکی وەهایە هەموو کەسێکی ناودار و ماقوڵ ڕێز لێ بگرێت و مافی خۆی بداتێ لە حورمەت و شکۆ و پێزانیندا، لەمەدا هەموو خەڵك وەك یەکە، بەڵام لە کاردانەوەیاندا بەرامبەر خەڵکە سادە و نەدار و ڕەشۆکییەکان جیاوازن، تۆ کاتێك کەسێك دێ ڕێزی لەسەر گەورەیی خەڵکەکە گرت و سۆزێکی کەم و بایەخێکی دروستکراوی بە خەڵکە سادەکە بەخشی، دەڵێیت ئافەرین بۆ ئەو سەرکردە.

ئەی ئەگەر مەردێکت دی سەرداری خەڵکەکەی لە شوێنی شایستەی خۆی دانا و هەمان فەرمان و بانگەشەشی بۆ بکات، پاشان لەگەڵ خەڵکە سادەکە و ئەوانەی حسابیان بۆ ناکرێت بایەخ و پێزانین و گرنگیان بداتێ، ڕەنگە ئەوەندە کاروباری دونیای و ئەرکی قیامەتی هەبن کەسانێك سەرقاڵ بکات تا لانەکەنەوە بەلای خەڵکی کەم ناو و نەناسراو و بێ پێگەدا، بەڵام بزانە مەزنترین سەرکردە چاو دیبێتی و گوێ بیستبێتی لەم بارەیەوە هەر ئەوە (ﷺ)).

# یەکەم گەوهەر

ئەبو رەفاعەی عەدەوی دەڵێت: (لەکاتی وتارداندا گەشتمە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێموت: ئەی پێغەمبەری خوا کابرایەکی غەریبە هاتووە پرسیاری لە دینەکەی هەیە، نازانێت دینی چۆنە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) رووی تێکردم و وتارەکەی جێهێشت و هات بۆ لای من، کورسیەکیان بۆ هێنا و وابزانم قاچەکانی ئاسن بوو، وتی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری دانیشت، دەستی کرد بە فێرکردنم لەوەی خودا فێری کردبوو، پاشان رۆشتەوە بۆ وتارەکەی و تەواوی کرد).[1]

یەکەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو: بایەخدانی پێویست و دەربڕینی پێزانینە بە هەموو کەسێك.

ئەوی دەروونەکانی ئافەریدە کردووە و نەرمو نیان و بێگەردی نواندووە دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا جَاءكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ﴾ (الأنعام: ٥٤).

(وَإِذَا جَاءكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا) ئەوانەن خودا نەهیکرد لە دەرکردنیان، ئەوانە باوەڕدارە هەژار و چەوساوەکان بوون.

(فَقُلْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ) بۆ دڵدانەوە و ڕێزلێگرتنیان.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش دابەزینی ئەم ئایەتە هەرکە دەیبینین لە سەلامکردنیاندا دەستپێشخەری دەکرد.[2]

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الجمعة، باب حديث التعليم في الخطبة، رقم: ١٥٠٦.

[2] زبدة التفسير من فتح القدير للأشقر، ١٧٩.

# بەشی دووهەم
# رەخنەو برینداركردن
# لە فەرهەنگی دەروونی مرۆڤایەتیدا

دەروونەكان لای خاوەنەكانیان ئازیزن، سەلارەیی مرۆڤیش گەوهەرێكی گرانبەهایە ئەگەر ئەم گەوهەرە بڕوشێت یان بریندار بكرێت مرۆڤ ئازار دەچێژێت و ناڕەحەت دەبێت، جا كاتێك پەروەرێن، یان موچیاركار، یان فەرماندە رەخنە دەكاتە هۆكاری ئاراستەكردن، دەبێت چاوەڕوان نەبێت ئەوانی دی رەخنەكەی وەرگرن و رازی ببن بە سەرزەنشتكردنەكەی.

# مندالە خزمەتكارە خۆشبەختەكە

ئەنەس ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ هاوەڵێتیەكی دوورودرێژی پێغەمبەری كرد (ﷺ)، بە باشیش گەردنگیر بوو بوو پێوەی، هەر لە ساتەوەختی كۆچكردنیەوە تا وەفاتكردنی، جەنگی بەدری بینی، زیاد لە جارێك غەزای لەگەڵ كرد، لە ژێر درەختەكەدا پەیمانی پێ دا،[1] پرسیار لە ئەنەس كرا ئایا بەشداری بەدر بووی؟ وتی بە پرسیاركەرەكە: دایك نەتبینێت، چۆن لە بەدر نادیار دەبم،[2] كەچی غەزاگێڕەرەوەكان بە بەدریی ئەژماریان نەكردووە، چونكە منداڵ بوو كە بەشداری كرد شەڕی نەكرد، بەڵكو لەناو كاروانی سوپاكەدا مایەوە، ریوایەتەكان ئاوها یەكدەخرێن.[3]

ئەنەس دەڵێت: (دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم (ﷺ) كرد، هەرگیز جنێوێكی پێنەدام، لێدانێكیشی نەكردم، نە پیاما هەڵگژاوە و نە رووی لێ گرژ كردووم، هەر فەرمانێكیشی پێ كردبم و كەمتەرخەمیم تێدا كردبێت سەرزەنشتی كردووم، خۆئەگەر كەسێكیماڵەوەیان

---

[1] سەیری : سير أعلام النبلاء، الذهبـي، بكە، ٣٩٧/٢.

[2] أخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب: معرفة الصحابة ، ذكر انس بن مالك، رقم ٦٤٤٦.

[3] ئەمە قسەی ئیمامی زەهەبییە، سەیری : سير أعلام النبلاء، الذهبـي، ٣٩٧/٢ و دوای ئەویش بكە.

سەرزەنشتی کردبم فەرموویەتی: وازی لێبێنن چونکە گەر شتەکە تەقدیر بوایە و بسازایە دەکرا).[1]

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: (هەرگیز پێی نەوتووم: ئاخ، هەرشتێکم کردبێت نەیفەرمووە بۆ کردت؟ ئەویشم وازلێهێنابێت نەیفەرمووە بۆ وازت لێهێناوە؟).[2]

## خوێندنەوەی دەقەکە

منداڵێك تەمەنی هەشت بۆ دە ساڵە، دەبێتە خزمەتچی مەزنترین سەرکردەی سەردەمی خۆی و پێش‌و دوای سەردەمی خۆیشی، شەووڕۆژ لەگەڵیەتی، لە ماڵ‌و لە سەفەردا، لە شەڕ و ئاشتییدا، لە شێوەی ئەم پەیوەندییە چی دێت بە خەیاڵماندا؟

ئایا قورسایی‌و هەستیاری ئەو بەرپرسیارێتیەی دەکەوێتە گەردنی ئەم منداڵە لەو گۆڕانکاریی چەرخەماندا و حاڵ‌و باڵ و سەروخوار بوونانەدا چەندە؟ دەبێت ژمارە و قەبارەی ئەو هەڵانە کە منداڵێکی وەها تێیکەوتبێت چەند بن؟ بیرکەرەوە دەبێت چەند ئەرکی سەرشانی دواخستبێت کە بۆ تەمەنی بانگەوازە کاریگەریی بووبێت و هەروەها لە کاتگرتنی فەرماندە و بەرژەوەندی خەڵکیش؟

دە دانە ساڵ بەبێ جنێوێك (هەرگیز جنێوێکی پێ نەداوم).

---

[1] أخرجه أبو تعيم في دلائل النبوة في الفصل الثاني عشر، حديث رقم ١٢٠.

[2] أخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح باب ما جاء في خلق النبي، برقم ٢٠٠.

ده دانه ساڵ (دەبێت چەند هەڵە و پەڵەی تێکەوتبێت) کەچی پەروەرێنەکە دەستێکی لێ بەرز نەکردووەتەوە، جگە لە خۆشەویستی و میهرەبانی و لێبوردەیی (هەرگیز لێی نەداوم).

ده دانه ساڵ باوکان، سەرکردەکان، پەروەردەکاران، فێر بن هەستی ئەم منداڵەی نەڕووشاندووە، تەنانەت بە ئەبرۆ دانەیەکدا یان رووگرژکردنێك (هەرگیز هاوارێکی بەسەردا نەکردووم و ر ووی لێ گرژ نەکردووم). ده دانه ساڵ بەبێ حەرفێك سەرزەنشت (فەرمانێکی پێ نەکردووم کەمتەرخەمیم تێدا کردبێت و سەرزەنشتی کردبم) دەخوایە سەڵاوات بڕێژە لەسەر ئەو موحەممەدەی کە بە ناردنی، منەتت باراند بەسەر ئوممەتەکەیدا و چاکەت لەگەڵ هەموو جیهان کرد.

ئەم بەها بڵند و گرانە (سەرزەنشتنەکردن و خۆبواردن لە رەخنە) یەکێکە لە نهێنییەکانی سەرکردایەتی کردنی سەرکەوتوویی موحەممەدی.

## دووهەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو: سەرزەنشتنەکردن و خۆبواردنە لە رەخنە

پایەی دەروونی ئەم نهێنییە لە نهێنییەکانی سەرکردە.

بێ بەهایی سەرزەنشت و بێ کەڵکی رەخنەی شکێنەر.

ژیاننامەی پێشینانمان چیرۆك و پەندی جوانیان تێدایە، کابرایەك لەگەڵ هاوڕێکەیدا گرفتێك چووە بەینیانەوە، وایکرد بەشی هاوڕێیەتی تیا بهێڵێتەوە، بۆیە پێی وت: (با سبەی سەرزەنشتی یەکدی بکەین) هاوەڵەکەی وەڵامی دایەوە (نا سبەی لە یەکدی دەبوورین).

بەڕێزم پێمبڵێ بزانم لەزەتت لەو دەربڕینە وەرگرت، شیرینایی ئەو سرودەت چەشت (سبەی لەیەکدی دەبوورین)؟!

ئا ئەم بەها سەرکردایەتیە لەسەر چاوەڕوانکردنی دروست دامەزراوە، لەگەڵ خوێندنەوەی وردی هەڵوێستەکە، کە لەسەر قبوڵکردنی سیاسەتی جوانی و ستایشکردنی و تێپەڕاندنی دژەکەی و ئارام لەسەر گرتنی بنیاتنراوە.

مەبەستی باڵا لە هەموو گفتوگۆیەکی راستگۆیانەی مرۆڤەکان، بەرزکردنەوەی دەروونی مرۆڤە لە خراپەکاری و هەڵەکردن، کەواتە دڵنیابە خراپترین رێگایەك بۆ گەشتن بەم بڵندبوونەوە، ئاراستەکردنی رەخنە و لۆمەکردنی کەسێکە کەوتبێتە هەڵەوە.

## گەوهەرە دەمەزەردەکە

دەروونەکان بۆ خاوەنەکانیان ئازیزن، شکۆ و سەنگینی مرۆڤیش گەوهەرێکی گرانبەهایە، کە ئەم گەوهەرە بروشێنرێت یان بریندار بکرێت مرۆڤ ئازار و ناڕەحەتی دەچێژێت، بۆیە کاتێك پەروەرێن، یان مۆچیار، یان فەرماندە رەخنە دەکاتە ئامرازی ئاراستەکردن، نابێت چاوەڕوان بێت رەخنەکەی وەردەگیرێت یان سەرزەنشتەکەی جێگەی رەزامەندییە. ئەنجامی سروشتی رەخنە و بریندارکردن، ناحەزی و بێزاری و بەرگریکردنی بەرامبەر لە خۆی و دروستکردنی بیانوو و پاساوهێنانەوەیە، تا شکۆی خۆی راگرێت و کەرامەتی بپارێزێت، رەخنەگریش لە تۆمەتبارکران بە کەمتەرخەمی و هەڵە پارێزراو نابێت،

ڕەنگە ڕەخنەی بریندارکەر گۆڕانکارییەك لە ڕەفتاری کوڕ یان موچەخۆر یان کەسێك بکات، بەڵام گۆڕانکارییەکی کاتییە و دۆخێکی کتوپڕ یان بەرژەوەندییەکی نزیك یان لاوازی پێویستی ڕەخنەلێگیراو دەیسەپێنێت، بەڵام هەرزوو کەسەکە دەگەڕێتەوە سەرە رفتاری پێشووی، هەرکە دیتی ئەو هۆکارە لاچووە یان چاودێرییەکەی لەسەر نەماوە.

## هاوەڵە دنیانەویستەکە

ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت: (ژنەکەی عوسمانی کوڕی مەزعوون چوو بۆ لای هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، بینیان ڕواڵەتێکی پەڕپووتی هەیە، پێیان وت: چیتە؟! قورەیش لە مێردەکەی تۆ دەوڵەمەندتری تێدا نییە، وتی: هیچی بۆ ئێمە نییە، ڕۆژەکەی بە ڕۆژووە و شەوەکەشی خەریکی شەونوێژە، پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە و ئەوەیان لا باسکرد، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) پێی گەیشت، فەرمووی: من چاولێکراوێکی باش نیم؟ وتی: باوك و دایکم بەقوربانت، چۆن چۆنی؟ فەرمووی: شەو بەخەبەر دەبیتو ڕۆژ بە ڕۆژوو؟ بەڵام خێزانت مافی بەسەرتەوەیە، جەستەت مافی لەسەرتە، دەی نوێژ بکەو بخەوە، بەرۆژوو بە و بیشکێنە، دەڵێت پاش ماوەیەك ژنەکەی هاتەوە بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە بۆنخۆشی وەك بوکی لێهاتبوو، وتیان: بەخ بەخ، وتی: خەڵکی چۆنە، ئێمەش ئاوامان لێهاتووە.[(١)]

---

[١] أخرجه ابن حبان في صحيحه كتاب البر والإحسان، باب ما جاء في الطاعات وثوابها، حديث ٣١٧.

## وەرن لەم هەڵوێستە رامێنن

عوسمانی کوڕی مەزعوون شەو سەر لە سووژدە و پشت چەماوە بە رکووع و خوداپەرستی بەسەردەبات، رۆژیش سك بەتاڵ و بەرۆژوو دەبێت، هاوسەرێکی گەنجی جوانیشی هەیە، لەسەر ئەو شێوە گوزەرانە لاسەنگەی ژیانی هاوسەرێتی خۆدەگرێت، دەچێتە لای هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ سکالاکردنێك، بەڵام ئەوان لێی دەپرسن، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە، تا مەسەلەکە بەرز دەبێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش پێی ناخۆش دەبێت.

## چۆن عوسمانی کوڕی مەزعوون ئەمەی کرد؟

دوا پەیام بۆ ئەوە هاتووە تا ببێتە رێگەی بەختەوەری خەڵك، تا لە ئامێزیدا دڵخۆش‌و دەروون ئاسوودە بن، پێویستیەکانی جەستە بەجێ بهێنن، ئەی بۆ ئەم گۆشەنشینیە لە عوسمانەوە روو دەدات؟ لەکاتێکدا شەریعەتی روون‌و مەشخەڵەکانی ئاین دەرکەوتبوون، ئەمەی عوسمان لە سەردەمی کۆتایی مەدینەشدا بوو.

## ئەی فەرماندەی پەروەرێن چی لەگەڵ عوسمان کرد؟

ناردی بۆ لای، بەڵام لەگەڵی تووند نەبوو، عەیبەی لە ئیشکەی نەگرت (واتە شەونوێژ و رۆژووەکەی)، بەردەوامبوونی رۆژوو و نوێژیشی لێ نەگرتەوە، بەڵکو رێنمایی وێنەیەکی تێرو تەسەلی کرد، کە هاوسەنگی دروستکردنە لە نێوان هەڵبژاردنی ئاخیرەت و لەبیرنەکردنی پشکی دنیایی.

بۆیە رێگە راستترەکە و کامڵترەکەی نیشاندا (من چاولێکراوێکی باشت نیم؟) کە دەزانیت من تەواوترین دروستکراو و لەخواترسترین و پارێزکارترینیانم، (من ئەخەوم و شەونوێژ دەکەم، بەرۆژوو دەبم و دەیشکێنم)، بۆیە دەرفەتێکی باشم بۆ دەرەخسێت بۆ خۆشکردنی دڵی هاوسەرەکانم و یاری لەگەڵ منداڵەکان و بەجێهێنانی کاری شەرعی، بڵاوکردنەوەی ئاشتی و سووکنایی بە قوژبنی ماڵەکەدا، نیشتەجێکانی خۆشگوزەران دەکەم و تینوێتییان دەشکێنم، بە بایەخدانی شایستەیان و خەندەیەکی راستگۆیانە، کە لە سایەیدا لێڵی ژیان و ماندووبوونی گوزەران دەرەوێنەوە.

ئەم چەند وشەیە دڵو دەروونی ئیبن مەزعوونی کەمەندکێش کرد.

باشە عوسمان بۆ شەونوێژی دەکرد و بە رۆژ بەرۆژوو دەبوو؟

ئەم بەو شەونوێژ و رۆژوو و خۆهیلاککردنە، بە تەمای گەیشتن بە پلەی بەرزی بەهەشت بوو، بەڵام بەرزترین پلەش ئەوەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ). دەی خۆ خاوەنی بەرزترین پلەی بەهەشت شەو لێی دەخەوێت و نوێژیشی تیادا دەکات و بە رۆژ بەرۆژوو دەبێتو دەشیشکێنێت، ئەو خاوەنی شەریعەتیشەو هەڵگری پەیامەکەشە، جا ئێمە کەنگێ رێگای بۆ رەزامەندی خودا لەوەی ئەو نزیکتر دەدۆزینەوە، یان رێبازێکمان لە رێبازەکەی ئەو باشترمان دەست دەکەوێ؟ هیچ رێنماییە لەوی ئەو تەواوتر نییە، بۆیە لە دڵی خۆیدا دەڵێت: ئەمە راستە با شوێنی کەوم، چونکە هەرچی خێری دونیاو قیامەتە لە شوێنکەوتنی ئەودایە.

## ژیانێکی نوێ و هاوسەرێکی بەختەوەر

پاشان سەیری رەهەندی گۆڕانکاریی و بەردەوامبوون لە ژیانی عوسمانی کوڕی مەزعووندا، گۆڕانکاری لە رەفتاریدا بە هەمیشەیی و سەقامگیریی روویدا، ئەوەتا هاوسەرەکەی دوای ماوەیەك دێتەماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، حاڵی گۆڕاوە، وەك ژنانی تر جلی جوانی لەبەر کردووە، لە رەنگو رووخساریدا سوکنایی و حاڵباشبوونی پێوە دیارە، ئەوانیش پرسیاری ئەم حاڵەی لێدەکەن، پێیان دەڵێت: رەفتاری عوسمان گۆڕاوە، بەشێوەیەك پشکی خۆی لە کاتو بایەخپێدانی عوسمانی خوداپەرستی دەستکەوتووە (وەك خەڵکمان لێهاتووە).

## ئەدەبی سکاڵاکردن

چ دەربڕینێکی نەرمونیانە، ماشەڵڵا چ ئافرەتێکی بە ئەدەبە، کە بە ماناوە و ناڕاشکاوانە دەڵێت: (هیچی بۆ ئێمە نییە، رۆژەکەی بە رۆژوو دەبێت و شەوەکەشی خەریکی شەونوێژە) دواییش هەر بەو زمانە بەرزە دەدوێت: (وەك خەڵکمان لێهاتووە).

## ئەبوبەکر ئازادی کردن

عائیشە ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: (پێغەمبەر دای بە لای ئەبوبەکر دا کە نەفرەت (جنێو)ی بە هەندێك لە کۆیلەکانی دەدا، ئاوڕی دایەوە بەلایدا و فەرمووی: جنێودەر و راستگۆ! نەخێر، نە بە خوای

کەعبە، دەستبەجێ ئەبوبەکر بەشێکی کۆیلەکانی ئازاد کرد و هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: دووبارەی ناکەمەوە.[1]

## عومەر رایکێشا

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێت: (کاتێك عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی مرد، کوڕەکەی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کراسەکەی خۆتم بدەیە با بۆی بکەم بە کفن و نوێژیشی لەسەر بکە و داوای لێخۆشبوونی بۆ بکە، ئەویش کراسەکەی پێدا و فەرمووی: کە حازرتان کرد ئاگادارم بکەن، ئەوانیش حازریان کرد و ئاگاداریان کرد، جا هات تا نوێژی لەسەر بکات، عومەر رایکێشا و وتی: مەگەر خودا رێگری لێ نەکردوویت کە نوێژ لەسەر دووڕووەکان بکەیت کە دەفەرموێت: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ﴾ (التوبة: ٨٠)، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَداً وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ﴾ (التوبة: ٨٤)، ئیتر وازی لە نوێژەکەی هێنا.[2]

---

[1] أخرجه البيهقي في شعب الإيمان، حديث ٤٩١٩ وأخرجه البخاري في أدب المفرد، باب من لعن عبده فأعتقه برقم ١٣٣ وصححه الألباني في تعليقه على الأدب المفرد.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب اللباس، باب لبس القميص، برقم ٥٤٧١.

## ئەوە خەڵکێك چیەتی؟

دایکی باوەڕداران عائیشە ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: تێکەڵی پێغەمبەرم کردووە زیاتر لە هەموو هاوەڵانی و هاوسەرەکانی لە ئیشە تایبەتەکانی ئاگادار بووم، ئەم راستگۆی کچی راستگۆیە سەبارەت بە بەرنامەی پێغەمبەر (ﷺ) لە چارەسەرکردنی شوێنی هەڵەکردن و راستکردنەوەی ئەو کەلێنانەی دەیبیستن، بە قووڵ خوێندنەوە و وریاییەوە بەرنامەی پێغەمبەرێتی لە کۆمەڵێك هەڵوێستو چەند رووداوێکدا دەخاتە روو، کە نموونەی رێگەیەکی سەرتاپاگیری و بنەمای گشتین لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەوانەی لە رێگە راستەکە لایانداوە.

جا عائیشە ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) کە بیبیستایە کەسێك شتێکی کردووە نەیدەفەرموو: بۆ فلانکەس وایکردووە؟ بەڵکو دەیفەرموو: ئەوە خەڵکێك چییانە ئاوها و ئاوها دەکەن).[1]

## بنەمایەك لە ئاراستەکردن و گۆڕانکاریی ئەرێنی

بنەما گشتییەکە خۆبواردنە لە سەرزەنشتنەکردن و رەخنەگرتن، عائیشە ـ خودا لە خۆی و بابی ڕازی بێ ـ بۆچوونەکەی خۆی لەم بنەما پێغەمبەرێتییە لەسەر کۆمەڵێك هەڵوێست بنیات دەنێت، کە هەندێکیان خۆی بە زاری خۆی دەیگێڕێتەوە و لەگەڵ هەندێکیشیاندا ژیاوە، ئەو فەرموودەی: (ئەوە خەڵکێك چیانە) زۆرن، ئەمانە بەشێکیانن:

---

[1] أخرجه أبوداود في سننه في كتاب الأدب، باب حسن العشرة، رقم ٤٢١٢ وقال الألباني صحيح.

١ـ عائیشه ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی کرد تیایدا هەندێك بە ئاسانکارییان دانا و خەڵکێکیش خۆیان لێ دوورگرت، ئەمە گەشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ)، جا سوپاس و ستایشی خودای کرد و پاشان فەرمووی: (ئەوە خەڵکانێك چیانە خۆیان بەدوور دەگرن لە شتێك من دەیکەم، وەڵاهی من لە هەموو خواناسترم و لە هەموشیان زیاتر لێی دەترسم).[1]

٢ـ ئیبراهیمی کوڕی یەزیدی کوڕی قەیس دەڵێت: (یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پێشنوێژی بۆ خەڵکێك کرد و نوێژەکەی زۆر درێژکردەوە، هەواڵەکە گەشت بە پێغەمبەر (ﷺ) جا فەرمووی: (ئەوە چییە کەسانێك خەڵك لەم ئاینە دەتارێنن، ئەوی پێشنوێژی خەڵکێکی کرد با نوێژەکە کورت بکات، چونکە ئەوانە نەخۆش و پیر و خاوەن پێداویستی تایبەتیان تێدایە).[2]

٣ـ ئەوەسی کوڕی سەریع دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بۆ غەزایەك دەرچووین و زاڵبووین بەسەر بتپەرستەکاندا، خەڵکەکە بەپەلە کەوتنە کوشتنیان، تەنانەتماڵو منداڵیشیان کوشت، ئەمە گەشتەوە بە پێغەمبەر، ئەویش فەرمووی: ئەوە خەڵکێك چییانە کوشتار وایلێکردوون بگەنە منداڵ کوشتنیش؟ با ماڵ و منداڵ نەکوژرێت، سێ جار دووبارەی کردەوە.[3]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة، رقم ٦٩٠٩.

[2] أخرجه محمد بن حسن في الآثار، باب تخفيف الصلاة، حديث رقم ١٨٤.

[3] أخرجه الدارمي في سننه في كتاب السير- باب نهي عن قتل النساء، حديث رقم ٢٤٢٨.

٤ـ ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاریان لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد دەربارەی کردەوەی پەنهانی پێغەمبەر، جا هەندێکیان وتیان: من ژن ناهێنم، هەندێکی تریشیان وتیان: هەرگیز گۆشت ناخۆم، هەندێکیش وتیان : لەسەر راخەر ناخەوم، جا پێغەمبەر (ﷺ) سوپاسو ستایشی خوای کرد و فەرمووی: ئەوە چییە خەڵکانێك ئاوها و ئاوها دەڵێن؟ بەڵام من نوێژ دەکەم و دەشخەوم، رۆژوو دەگرم و دەشیشکێنم، ژنیش دەهێنم، ئەوەشی لەم رێڕەوەی من دەرچێت لە من نییە.[1]

لەبەرئەوەی هەندێك جار کەموکورتی و هەندێك جار هەڵە و نەزانی لە ناو منداڵ و شوێنکەوتوواندا روو دەدەن، ئێمە بۆمان هەیە بپرسین ئەی پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ) لەگەڵ ئەم حاڵەتانەدا چۆن چۆنی مامەڵەی دەکرد؟ بەتایبەت لەمڕۆدا کە هەندێك کەس وادەبینن کە شکاندن و تانەدان، بەڵکو لێدانیش زەرورەتە و نابێت ئەوانەی خەڵکانێك لەبەردەستیاندایە و کاروباریان بەڕێوە دەبات پشتگوێی بخەن.

## رێزی مزگەوت

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (لە مزگەوتدا بووین لەپڕ دەشتەکییەك هات و هەستا لە مزگەوتەکەدا میزی کرد، هاوەڵانی پێغەمبەر وتیان: مەکە، مەکە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: تەریقی

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب النكاح، باب استحباب النكاح لمن تاقت نفسه اليه، برقم ٢٥٧٥.

مەکەنەوە، وازیلێبهێنن، ئەوانیش وازیان لیّ هێنا تا میزەکەی کرد، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد و پێی وت: ئەمانە مزگەوتن، میز و پیسی تێدا ناکرێت، تایبەتن بە زیکری خودا و نوێژ و قورئان خوێندنەوە، (یان قسەیەکی بەو مانایە کرد)، دەڵێت: فەرمانی بە کەسێکی ناو خەڵکەکە کرد سەتڵێك ئاوی هێناو پیایدا رژاند)،[1] لە ریوایەتێکی دیکەدا دەڵێت: (کابرای دەشتەکی لە نوێژەکەدا وتی: خوایە رەحم بە من و موحەممەد بکە و رەحم بە کەسیتر لەگەڵمان مەکە، کە پێغەمبەر (ﷺ) سەلامی دایەوە وتی بە دەشتەکیەکە: فراوانیەکت تەسککردەوە)، مەبەستی رەحمەتی خودا بوو.[2]

## خراپە بە چاکە

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا رێمدەکرد، عەبایەکی نەجرانی ملیوان زبری لەبەردا بوو، دەشتەکیەکی پێگەیشت توند عەباکەی راکێشا کە سەیری ملی پێغەمبەرم کرد شوێنەواری ملیوانی عەباکە بەهۆی راکێشانکەوە بە ملیەوە دیار بوو، وتی: ئەمر بکە لەو ماڵەی خوا کە لای تۆیە بەشم بدەن، پێغەمبەر لایکردەوە و پێکەنی، پاشان فەرمانی دا بەشی بدەن.[3]

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الطهارة حديث رقم ٤٦٠.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأدب برقم ٥٦٨٣.

[3] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب فرض للخمس برقم ٣٠٠٢.

## رازاوەیەکی ناشایستە

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (کابرایەك چووە لای پێغەمبەر (ﷺ) عەبایەکی زەرد (بریقو باقی) لەبەردا بوو، کاتێك کابرا هەستا، پێغەمبەر (ﷺ) بە هەندێ لە هاوەڵانی فەرمووی: ئەگەر پێی بڵێن ئەو شتە لابات، مەبەستی عەبا زەردەکە بوو، دوو یان سێ جا وتیەوە، پێغەمبەری خوا زۆر کەم ڕووبەڕوو ئەگەر شتێکی حەز لێنەکردایە بە کابرای دەوت).[1]

## دەستە خاوێنەکە

عائیشە ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا هەرگیز بەدەستی خۆی لە کەسی نەداوە، نە ژن، نە خزمەتکار، مەگەر لە جیهادکردندا).[2]

## یەکەم مامۆستا

موعاویەی کوڕی حەکەمی سەلەمی ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژم دەکرد، کابرایەك پژمی، وتم: یرحمك الله، خەڵکەکە بە تیلەی چاویان لێیان دەڕوانیم، وتم: دایکەڕۆ، ئەوە چیتانە وا سەیرمەدەکەن؟ ئیتر بە دەستیان دەیاندا لە رانیان، جا زانیم بێدەنگم دەکەن، بێدەنگ بووم، کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژ بووەوە، بە باوك و دایکەوە بە قوربانی بم، چونکە نە لە پێش ئەو و نە لە دوای ئەو مامۆستای وەهام نەدیوە، کە فێرکار بێت، سوێند بە خوا

---

[1] أخرجه أحمد في مسنده، برقم ١٢٣٤٢.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل برقم ٤٤١٧.

نەپێمدا هەڵشاخا و نە لێیدام و نە قسەی پێ وتم، فەرمووی ئەم نوێژە هیچ قسەی خەڵکی تێدا ناکرێت، بەڵکو تەسبیحات و ئەڵڵاهو ئەکبەر کردن و قورئان خوێندنە).[1]

## سەرکردە لە تەوراتدا

عەتا دەڵێت: گەشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر وتم: باسی پێغەمبەرم بۆ بکە لە تەوراتدا وتی: باشە بە خوا لە تەوراتیشدا بە هەندێك سیفەتی لە قورئاندا وەسفکراوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً﴾ (الأحزاب: ٤٥)، پەنای خەڵکی، تۆ بەندەو پێغەمبەرمی، ناومناویت (المتوکل)، نەگرژ و مۆنیت و نە دڵڕەق، نە لە بازاڕەکاندا قاڵە قاڵکاری، خراپە بە خراپە وەڵام نادەیتەوە، بەڵکو لێخۆشبوو و لێبوردەیت، خودا نایکوژێت تا گەلێکی خواری پێ ڕاستنەکاتەوە، کە بڵێن لا اله الا الله، چاوانێکی کوێر و گوێیانێکی کەڕ و دڵانێکی داپۆشراوی پێ دەکاتەوە؟).[2]

## چارەسەری تووڕە

سولەیمانی کوڕی سەرد دەڵێت: دوو پیاو لای پێغەمبەردا (ﷺ) کەوتنە قسە بەیەکوتن و ئێمەش لای دانیشتبووین، یەکێکیان کە قسەی بە هاوەڵەکەی دەوت، ئەوەندە تووڕەبوو رووخساری هەڵگەڕابوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: قسەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێت ئەو

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب المساجد ومواضيع الصلاة برقم ٨٧٥.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب البيوع برقم ٢٠٣٨.

تووڕەییەی دەڕوات، ئەگەر بڵێت: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم، وتیان بە کابرا، نابیستیت پێغەمبەر چی دەفەرموێت؟ وتی: خۆ شێت نیم.[1]

## بێدەنگی بەرامبەر هاتوهاوار

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆ ماڵی دایکی ئەیمەن، منیش لەگەڵی چووم، ئەویش جامێکی پێدا کە خواردنەوەیەکی تێدا بوو، دەڵێت: نازانم ئایا بەڕۆژوو بوو یان وەرینەگرت، ئیتر ئوم ئەیمەن کەوتە هاتوهاوار و بۆڵاندن بەسەریدا.[2]

## کاتێك سەرکردە تووڕە دەبێت لۆمە و گلەیی دەکات

ڕەنگە خوێنەر کاتێك ئەم بەشە دەخوێنێتەوە کە جەخت لە ڕەخنەنەگرتن و لۆمەنەکردنی پێغەمبەر (ﷺ) دەکاتەوە، ئەوە بێت بە مێشکیدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندین دەستەواژەی تووڕەبوونی بەکارهێنابێت، بەناوبانگترینیان: (مەعاز تۆ خەڵك تێکدەدەیت)، یان (ئایا سنگت شەقکردووە؟)، یاخود (پەنا بەخوا دەگرم لەوەی خالید کردوویەتی) لە نموونەی ئەمانە. جا بۆ ئەوەی دەقەکان لە سیاقی سازانیدا لەگەڵ لۆمەنەکردن بخوێنینەوە، هەروەها لە سیاقی هاودژنەبوونی لەگەڵ ئەو خەسڵەتەی باسمانکرد بخوێنینەوە، دەبێت سەرنجی وێستگەکان بدەین و هەڵوێستەیان لەسەر بکەین تا پەندیان لێ هەڵبهێنجێنین بە ئەنجامێکی دروستیشەوە لێی دەرچین.

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في الأدب المفرد برقم ٥٧٨٢.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه كتاب فضائل الصحابة، ٤٦١٤.

## خودایە لای تۆ بەریم لەوەی خالید كردی

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەڵێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) خالیدی كوڕی وەلیدی نارد بۆ ناو بەنی (جزیمە)، بانگی كردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش باش نەیاندەزانی بڵێن: موسڵمان بووین، وتیان: (صبئنا، صبئنا)، واتە: پاشگەزبووینەوە (مەبەست لە ئاینی پێشووی خۆیان بووە) جا خالید كەوتە كوشتن و بەدیلگرتنیان، هەر لە پیاوێكیش لە ئێمە دیلی خۆی پێدا، كە رۆژ بووەوە، خالید فەرمانی دەركرد با هەر پیاوێك دیلی خۆی بكوژێت، وتم: بەخوا من دیلی خۆم ناكوژم، هیچ هاوەڵێكی منیش دیلی خۆی ناكوژێت، تا هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و باسەكەمان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەستەكانی بەرزكردەوە و فەرمووی: خودایە لای تۆ بەریم لەوەی خالید كردوویەتی، دووجار وتیەوە).[1]

### سەرنجێك:

(لای تۆ بەریم لەوەی خالید كردویەتی) راگەیاندنە لە لایەن سەركردەی مەزنەوە (ﷺ)، روونیدەكاتەوە كە ئیجتیهادەكەی خالید لە جێگەی خۆیدا نەبووە، بەڵكو لە كوشتنی دیلەكاندا بەهەڵەدا چووە، پێش لەویش ئەوانەی ئەمانە چووبوونە لایان هەڵەیانكرد كە وتبوویان: صبئنا، صبئنا، كە بەمانای پاشگەزبوونەوە دێت لە ئاین، لەبری: موسڵمان بووین، موسڵمان بووین، رەخنەكەش رووی لە كارەكەیە نەك بكەرەكە، ئەمەش جوانترین ئەدەبو باشترین فێركردنە.

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، رقم ٤١٠١.

## سنگیت لەتکرد!

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سریەیەکدا ناردینی، بەیانیمان لە (حوروقات)ی جوهەینە کردەوە، گەشتمە کابرایەك وتی: لا اله الا الله، بەڵام تیرێکم تێهاویشت (کوشتم)، کەچی خورپەیەك کەوتە دڵمەوە، کە هاتمەوە بۆ پێغەمبەری خوام (ﷺ) گێڕایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا وتی: لا اله الا الله و تۆش کوشتت، دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا لە ترسی چەکەکە وایوت، فەرمووی: ئەی بۆ دڵت لەتنەکرد بزانیت لەبەرئەوە وتوویەتی یان نا؟ جا ئەوەندە دووبارەی کردەوە لێم، هەتا ئاواتم دەخواست کە ئەو ڕۆژە موسڵمان بوومایە).[1]

**سەرنج:**

پاش ئەوەی ئوسامە بەبێ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە و لەسەر گومان کەسێك دەکوژێت، دەفەرموێت (ﷺ): (ئەی بۆ دڵت لەتنەکرد تا بزانیت لەبەرئەوە وتوویەتی یان نا؟) واتە: تۆ نیازی قسەی کابرات نەدەزانی، بۆ کوشتت؟ ئەم دەستەواژەیە لە جێگای خۆیایەتی، بەڵکو لەم هەڵوێستەدا زۆر ناسکە و ئامانجی خۆیشی پێکا.

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الإيمان، رقم ١٦٨.

## ئەی مەعاز ئایا تۆ گومڕاکاریت؟

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: (مەعازی کوڕی جەبەل نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد و دوایی دەهاتەوە ناو قەومەکەی نوێژی بۆ دەکردن، لە نوێژەکەدا سورەتی (البقرة)ی خوێند، دەڵێت : کابرایەك نوێژەکەی لەگەڵ بڕی، بەتەنها نوێژێکی کورتی کرد، ئەمە گەشتەوە بە مەعاز، وتی: ئا ئەوە مونافیقە، کابرا قسەکەی بیستەوە، هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە خەڵکێکین بە دەستەکانمان کاردەکەین و بەهێز و بازومان ئاو دەدەین، مەعازیش دوێنێ نوێژی بۆ کردین سورەتی (البقرة) خوێند، منیش نوێژەکەم بڕی، ئێستا ئەو وادەزانێت من دووڕووم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی مەعاز ئایا تۆ گومڕاکاریت؟ سێ جار، سورەتی (والشمس وضحها) و (سبح اسم ربك الاعلى) و هاوشێوەیان بخوێنە).[1]

**سەرنج:**

دوورکەوتنەوەی خەڵك لە مزگەوتەکان و حەزنەکردنیان لە نوێژ خراپەیەکی زۆر گەورەیە، بۆیە سەرکردەی پەروەردەکار (ﷺ) قەسەیەکی روون لەگەڵ مەعاز دەکات و مەترسی کارەکەی بۆ رووندەکاتەوە، قسەکەشی لە شێوازی هەواڵی پرسیاردا دەربڕیوە، بەڵکو لە شێوەی پرسیار و سەرنجڕاکێشاندا وتوویەتی: (ئایا تۆ گومڕاکاریت؟) روونیشە چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان بڕیار و پرسیاردا؟

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأدب، رقم ٥٧٧٣.

وەك ئەمانەتێكی زانستی لە هەندێك ریوایەتدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) قسەكەی لە شێوەی هەواڵدا فەرمووە: (فتان، فتان، فتان) گومڕاكار، گومڕاكار، گومڕاكار.[1]

لەم شێوە دەربڕینەشدا بەڵگە نییە كە مەعاز لەو شوێنەدا ئامادەیی بووبێت و گوێبیستی فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) بووبێت، چونكە مەعاز لە پێشەوە سكاڵای لەسەر كابرا كردبوو لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) ناردی بە شوێنیدا، كابرا هات و مەعاز لەوێ نەبوو، پێغەمبەریش هۆی جێهێشتنی نوێژی جەماعەتی لێپرسی، ئەویش ئەوەی وتی سەبارەت بە كارەكەی مەعاز بەبێ ئامادەیی ئەو، چونكە رەنگە ویستبێتی خەڵك لەم ئیشەی مەعاز دوورخاتەوە، بۆیە بەو شێوەیە قسەی كردووە، خوداش دەیزانێت.

پێشەوا داوود (رەحمەتی خوای لێ بێت) قسەیەكی ناسك لەوبارەوە دەكات كە بە ئاراستەیەكی دیكە بڕیارەكەی پێغەمبەر (گومڕاكار) لێكدەداتەوە، كە رەنگە مەبەستی لەو دەستەواژەی (فتان)ە، ئازاردەر بێت، چونكە بەو درێژكردنەوە ئازاری پێ دان، پەروەردەگاریش دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ)[2] دەوترێت (فَتَنُوا) بە مانای ئازاردان هاتووە.[3]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأدب، رقم ٥٧٧٣.

[2] البروج : ١٠

[3] سەیری: فتح الباري شرح صحيح البخاري، ٢٤٩/٢ بكە.

## دەرئەنجام

پێغەمبەری خوا بە پەروەردەکار و مامۆستا و ڕێنیشاندەر ڕەوانەکراوە، نەك زۆردار و بێزارکار، ئەمەش ئەوە پێویست دەکات هەر هەڵە و پەڵەیەکی لە هاوەڵانی بینی فێری دروستەکەیان بکات و ئاراستەیان بکات، ئەمەش داخوازییە بڵندەکە و هۆکارە تێرو تەسەلەکەیە، جا ئەم فێرکردنانە جۆراوجۆر بوو بەپێی پێگەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵی دەژیان، کەواتە بنەماکە ئەوەیە پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ) سیاسەتی هۆشیارکردنەوە و فێرکاری و پەروەردەکردن بگرێتەبەر، پایەی روونی هەموو ئەمانەش نەرمونیانی و سۆز و بەزەیی بوو، کە بەخۆدوورگرتن لە لۆمەکردن و ڕەخنەگرتن رازابووەوە.

بەڵام کاتێك هەڵەی گەورە دەکرێت و تاوانی ناشیرین ئەنجام دەدرێت، یان کاتێك کارەکە پەیوەستە بە بەرژەوەندی باڵای کۆمەڵگەی موسڵمانەوە، وەك: دەسەڵاتدارێتی، حوکمڕانی، سەرپێچی گەورە، وەك خوێنڕشتن، زیندووکردنەوەی دەماری نەفامێتی، یان سوکایەتی بە دروشمە ئاینیەکان، یان خراپەکردن و بەردەوامبوون لەسەری بەلوتبەرزانە، هۆشبەری، لەم کاتانەدا پێغەمبەر (ﷺ) پێویستە بابەتەکە بە روونترین دەربڕین ڕۆشن بکاتەوە، ئەمەش هەستانە بە بەجێهێنانی راسپاردە و ئەرکی سەرشان.

لە سەرەتاوە رەنگە بۆ خوێنەر لە هەندێکیاندا شتێك توندی ببینێت، بەڵام کە لێی ورد دەبێتەوە تێدەگات مەبەستی سەرکردەی

پەروەردەكار (ﷺ) و وتەكانی نزمترین پلەی زبری و كەمترین پلەی توندییان تێدایە، چەند جار دەخوێنینەوە (بەتوورەییەكی، زۆر توورە هەستا)، یان (روخساری وەك دەنكە هەنار سوور هەڵگەڕابوو)، یان (رووخساری داگیرسابوو)، كەچی دوایی كە بابەتەكە تەواو دەكەیت و دەگەیتە كۆتایی چیرۆكەكە دەبینیت دەربڕینەكە لەگەڵ دیمەنەكە یەكسان نییە، كە وردیش دەبیتەوە و بەراورد دەكەیت و دەربڕینەكان بە هێمنی سەرنج دەدەیت تۆ بۆنی توورەیی خواردنەوە و خۆگرتن دەكەیت، بەرزی ئەدەب دەبینیت و گوێت لە سەدای سۆز و بەزەیی دەبێت لەگەڵ بەرامبەرەكەیدا، دەزانیت نیازی پاراستنی بەرژەوەندیی دنیا و قیامەتی ئەو و سەلامەتی دین و ئیمانی ئەو بووە.

## بنەمای گشتی

بنەماكە ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێبازی نەرمونیانی و ئامۆژگاری و فێركردنی دەگرتەبەر، هەڵەكان هەرچۆن بونایە، جا لەبەر نەزانی بووبێت یان خویەكی خراپ، یان حەزی ئارەزوو یان .... پێغەمبەری خوا (ﷺ) لۆمەكردن و رەخنەگرتنی نەبوو.

## ئەوی ئەو حاڵەتانەی پێشوو نایگرێتەوە

جا ئەگەر شتێكت بینی هیچكام لەو حاڵەتانەی پێشوو نەیدەگرتەوە، بزانە ئەوە وەك سەركردەیەكی ئادەمی (ﷺ) لێی رووداوە، فەرمووشیەتی: (خودایە موحەممەدیش مرۆڤە، وەك خەڵك توورە

دەبێت، منیش لە تۆ وادەیەکم وەرگرتووە کە بە دڵنیاییەوە وادە خیلاف نابیت، دەی ئەگەر ئەزیەتی هەر موسڵمانێکم دابێت، یان قسەیەکم پیێ وتبێت، یان قامچییەکم لێدابێت، خودایە بیکە بە کەفارەت و پەرستش بۆی لە رۆژی قیامەتدا).[1]

## گەوهەری موحەممەدی

وەرن بۆ گوڵزاری پەروەردە و سەرچەشمەی تێرئاوی، هێندە لەو ئاوە سازگار نۆشکەن تا تینوێتیتان دەشکێت.

## گەوهەری دووهەم

خەواتی کوڕی جوبەیر دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە (مرّ الظهران) دابەزین، دەڵێت: لە خێمەکەی خۆم چوومە دەرەوە، دەبینم کۆمەڵە ژنێك وتووێژیانە منیش حەزم لە قسەکانیان دەکرد، گەڕامەوە و باوەڵەکەم کردەوە و عەبایەکم تێدا دەرهێنا و لەبەرمکرد، هاتمەوەو لایان دانیشتم، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە کەپرەکەی خۆی هاتەدەرەوە و وتی: باوکی عەبدوڵڵا بۆ لەناو ژناندا دانیشتویت، کە پێغەمبەری خوام بینی سامگرتمی و هاتمەوە بۆ ناو خەڵك، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا : حوشترەکەم بەربووە بۆ پەتێك دەگەڕێم بۆی، ئیدی ئەو رۆیشت منیش دوای کەوتم، کراسەکەی خۆی بۆ هەڵدام و چووە

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب البر والصلة والأداب برقم ٤٨٣٢.

کەپرەکەوە، سپێتی پشتیم دەبینی لەناو سەوزایی کەپرەکەدا، جا دەستی بەئاو گەیاندو دەستنوێژی گرت، ئاو بە ڕیشیدا هاتە خوار و دەکەوتە سەر سنگی، فەرمووی: باوکی عەبدوڵڵا حوشترە بەربووەکەت چی لێهات، پاشان بارمانکرد، ئیتر لە ڕێگا هەرکە دەگەیشت پێم دەیفەرموو: سڵاو باوکی عەبدوڵڵا حوشترە بەربووەکە چی لێهات، کە ئەمەم بینی خێرا گەڕامەوە مەدەینەو خۆم لە هاتوچۆی مزگەوت و مەجلیسی پێغەمبەر (ﷺ) دەپاراست، ئەمەش درێژەی کێشا تا جارێك کاتی چۆڵبوونی مزگەوتم بەفرسەت زانی و چوومە مزگەوت و دەستم بە نوێژ کردن کرد، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەناکاودا لە ماڵێکیەوە هاتو دوو رکات نوێژی کورتی کرد، من نوێژەکەم درێژ کردەوە بەو هیوایەی بڕوات و بەجێمبهێڵێت، فەرمووی: باوکی عەبدوڵڵا چەندەی دەتەوێت درێژی بکەوە، من هەڵناسم تا تەواوی دەکەیت، لە دڵی خۆمدا وتم: بە خوا مەعزەرەت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەهێنمەوە و دڵی پاك دەکەمەوە، جا کە فەرمووی: سڵاوت لێ بێت باوکی عەبدوڵڵا حوشترە بەربووەکەت چی لێهات؟ وتم: سوێند بەوەی تۆی بەڕاستی ناردووە، لەو ڕۆژەوەی موسڵمان بووم ئەو حوشترە بەرەڵا نەبووە، جا فەرمووی: رەحمەتی خوات لێ بێت (سێ جار)، ئیتر دوای ئەوە ئەوەی پێشوو دووبارە نەبووەوە.[1]

---

[1] أخرجه الطبراني في الكبير، ٤٠٣٣، وقال الهيثمي في المجمع ٤٠٤ رجاله صحيح.

## دووهەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو:
## خۆلادانە لە رەخنەی رووشێنەر و سەرزەنشتنەکردن

خودا دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ (آل عمران : ١٥٩).

(رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ) واتە: لە رەحمی خودا وە بۆ تۆ و بۆ ئەوانیش.

(لِنتَ لَهُمْ) نەرمبوویت لەگەڵیان تا دڵەکانیان ئولفەت پێ بدەیت و کاربارى ئاینیان راستکەیتەوە.

(وَلَوْ كُنتَ فَظّاً) (الفظ) واتە: زبرو رەق، رەفتار ناشیرین.

(غَلِيظَ الْقَلْبِ) دڵرەق و بێ سۆز و کاریگەرنەبوون بە چاکە.

(لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ) جێیاندەهێشتی و پەرت دەبوون.

(فَاعْفُ عَنْهُمْ) لەو مافانەی کە پەیوەیستن بە خۆتەوە.

(وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ) داوای لێبوردنیان لە خوا بۆ بکە لەو مافانەی پەیوەستن بە پەروەردگارەوە.

(وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) لەو کارانەی بۆت دێتە پێشو جێگای راوێژن، راوێژیان پێ بکە، بۆ ئەوەی دڵیان خۆشکەیت و خۆشەویستییان راکێشیت).[1]

---

[1] زبدة التفسير للأشقر ل٨٩، بە دەستکارییەکی کەمەوە.

# بەشی سێهەم
# ناوی جوان و پیاهەڵدانی شیرین
# لە فەرهەنگی دەروونی مرۆڤایەتییدا

ناو لای خاوەنەکانیان خۆشەویستن و بۆ ئەوان مانای زۆرە، شانازی پێوە دەکەن و دەیکەنە ناونیشانی سیمبولی کەسایەتیان، بۆیە مامەڵەکردنی جوان لەگەڵ ئەم دەمارەدا نزیکترین ڕێگای گەیشتن بە دڵو دەروونەکانە.

## ئەسپ و خێر

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: لای پێغەمبەر بووین (ﷺ)، سوارێك هات و لایدا دابەزی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، من ڕێگەیەکی نۆ ڕۆژیم بڕیوە تا هاتوومەتە لای تۆ، وڵاخەکەم ماندوو کردووە و شەوگارم شەقکردووە و ڕۆژانیشم بە تینوێتی هێناوە تا لە دوو شت پرسیارت لێ بکەم کە خەویان لێزڕاندووم:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ناوت چییە؟ وتی: زەیدی خەیل (ئەسپ)، فەرمووی: نا، بەڵکو زەیدی خێر، پرسیارکە ڕەنگە پرسیار لە ئاڵۆزییەك بکەیت، وتی: کەسێك خودا بیەوێت یان نەیەوێت نیشانەی چییە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چۆن ڕۆژت کردووەتەوە؟

وتی: کە هەستاوم خێر و خێرۆمەند و هەرکەسیش ئیشی پێبکات خۆشم دەوێت، کە خێریش دەکەم دڵنیام لە پاداشتی، ئەگەر لەدەستیشم دەرچێت دڵم بۆی دەسووتێت.

جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە نیشانەی خودایە بۆ کەسێك کە بیەوێت و نیشانەشیەتی بۆ کەسێك کە نەیەوێت، خۆئەگەر ئەویدیکەی ویستبا پێت تۆی بۆ ئامادە دەکرد، بێباکیش بوو لە چ شیوێك تیادەچوویت.[1]

---

[1] أخرجه ابو نعيم في حلية الأولياء ١١٦/٤، وقال غريب، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ١٩٧/٧ فيه عون بن عمارة وهو ضعيف، وأخرج نحوه وتبعاهم في كتاب السنة رقم ٣٣٣.

# خوێندنەوەی دەقەکە

ئەم کابرایە دەشتو دەری دابووەبەر لەبەر پەرۆشی، کاروانێکی دوردرێژی نۆ رۆژی بڕیوە، وەختبووە وڵاخەکەی بتۆپێت و خۆیشی کۆتایی پیێ بێت.

قریقەی گەرمای بیابانی جەزیرەی تەحەمول کردووە، بە رۆژ رێگەی پڕ لە تینوێتی و گەرمی بڕیوە، بە شەویش بە خۆپارێزی و خۆبواردن هەر بە رێگاوە بووە، زۆر بە کەمی نەبێت سەرخەویشی نەشکاندووە لەبەر تاریکی و تەنیایی رێگا و دوژمن زۆری، پاشان دەگاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وڵاخەکەی دەبەستێتەوە و وتارێکی کورت دەدات ئەوەی دەروونی دەرزی ئاژن کردووە و لەناخیدا گینگڵ دەخوات، دەریدەبڕیت (هاتوومە لات رێگایەکی نۆ رۆژیم بڕیوە، وڵاخەکەم ماندوو کردووە، شەوگارم شەقکردووە، رۆژگاریشم بە تینوێتی بردووەتە سەر تا لە دوو شت پرسیارت لیێ بکەم).

ئەی پەروەردەکارە بەڕێزەکە چۆن پێشوازی لیێ کرد؟

بەهیچ شێوەیەك گومانم نییە کە پێغەمبەر (ﷺ) دوو کاری ئەنجامداوە، یەکێکیان لە سیاقی چیرۆکەکەوە تێی دەگەیت، دووهەمیان لە خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەرەوە دەزانرێت.

یەکەم: گوێی بۆ قسەکانی رادێراو وازیلێهێنا تا ئەوەی لە دڵیدایە خاڵی کرد، کە ئەو سەفەرە سەختە و ئەو رێگە درێژەی بۆ بڕیبوو.

دووهەم: زەردەخەنەیەکی جوانی درێژی بەڕوودا کردووە کاتێك گوێی لە وتارە کورتەکەی گرتووە.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سێ پرسیاری لێ کردووە.

یەکەم: پرسیاری ناوی لێکردووە، کە لێرەدا ئەمە مەبەستەکەی ئێمەیە.

دووهەم: پرسیاری داخوازییەکەی لێ کرد.

سێهەم: پرسیاری لە حاڵ و ئەحواڵی لێکرد.

دیارە کابرا پێش ئەوەی بێت، پێغەمبەرەکەی ناسیوە، بەرلەوەش ئیمانی پێ بهێنێت شارەزای سیفەتەکانی بووە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) نە ناو و نە نازناوی کابرای نەدەزانی، بۆ یەکەم وەڵامی دوای وتارە کورتەکە پڕ ماناکەی ئەوە بوو: ناوت چییە؟ ئەمەش پرسیارێکە و شتی دیکەی بەدوادا دێ، چونکە مرۆڤ سروشتی وەهایە حەز دەکات باسی خۆی بکات و پێیخۆشە باسی خۆی بگێڕێتەوە، سیفەتە جوانەکانی بخاتە ڕوو، وەك ئازایی و بەهێزی و خانەدانی و ڕەوشتبەرزی، لە وتارەکەی کابراشدا گشت ئەمانە دەرکەوتن. پاشان پرسیارکردنی ناو دەروازەی یەکترناسین و مزەی خۆشەویستی و سەرەتای دۆستایەتییە.

پێغەمبەری ئازیز وەك بڵێی: باشە چیرۆکەکەتمان بیست و لە خۆشەویستی و پەرۆشیت گەیشتین، زانیشمان لەم ڕێگە بڕینەدا بۆ لامان چەند شەکەت بویت، دەی با ناویشت بزانین تا خۆشمان بوێیت و نزیکیت بزانین و بتناسین، ئیتر دەبیتە هاوەڵمان لەناوماندا بە ناوەکە بناسرێیتەوە، میوانە بەڕێزەکەش وەڵام دەداتەوە: من زەیدی خەیلم (خەیل واتە ئەسپ) لەگەڵ جوانی ئەسپ و هەڵکەوتوویی و باشێتی لەناو گشت چارەوێکاندا، بەڵام پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ویستی پێگەیەکی بڵندتر و پلەیەکی بەرزتر بەکابرا ببەخشێت باشتر بێت لە

(زەیدی خەیل)، بۆیە نازناوێکی بەرزتر و وەسفێکی تێروتەسەلتری پێبەخشی (زەیدی خێر)، ئیتر ئەم پیاوە دەبێتە زەیدی هەموو خێرو بێرێك، خێر بە گشتی، دەشبێتە پشتیوان بۆ خێرەکان، ئەسپیش تەنها بەشێکە لە خێر، لە فەرموودەشدا هاتووە: (ئەسپ خێر بەستراوە بەناوچاویەوە، تا رۆژی قیامەت، کە پاداشتو دەستکەوتە).[1]

بۆیە نازناوە گشتییە فراوانەکەی پێبەخشی (خێر)، بەشە خێرەکەش کە (ئەسپ)ە دەگرێتەوە.

دوای ئەم یەکترناسینە دڵسۆزانە کە بە هۆیەوە ماندوێتی رێگابڕینەکە دەشکێت، کابرا دەکرێتەوە و دەحەوێتەوە، بۆیە ئەوی خەیاڵی قاڵ کردووە و ئەم رێگە دوورودرێژەی لەپێناودا بڕیوە، دەردەبڕێت (پرسیاری نیشانەی خودات لێ دەکەم بۆ کەسێك کە بیەوێ، نیشانەی خوداش بۆ کەسێك کە نەیەوێت).

## حاڵت چۆنە

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بە پرسیارکردن لە حاڵی، دەستپێشخەری دەکات (چۆن رۆژت کردووەتەوە؟) دەیەوێت پانتاییەکی دیکەی قسەکردن بڕەخسێنێت بۆ میوانەکە، تا ئەوەی لە دڵیایەتی هەڵبڕێژێت، بۆ ئەوەی هەر لە قسەکانی خۆیدا بەڵگە بۆ وەڵامی پرسیارەکە بهێنێتەوە، وەك بڵێی دەیەوێت پێی بڵێت: تۆ کەسێکی خاوەن زانیاری

---

[1] أخرجه البخاري في جامع الصحيح في كتاب الامارة رقم ٣٥٨٧.

و عاقڵیت، ئێمە زانیاری زیاترت بۆ زیاد ناکەین و شت زۆر ناخەینە سەر قسەکانت، کابراش بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکەی دەداتەوە (کە ڕۆژمکردووەتەوە خێر و خێرۆمەندم و ئەوەش ئیشی پێدەکات خۆشمدەوێت، ئەگەر خێرم کرد چاوەڕوانی پاداشتەکەی دەکەم، ئەگەر لە کیسیشم چوو، داخی بۆ دەخۆم)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (ئەمەیە نیشانەکانی خودا لەوەی کە دەیەوێت و نیشانەکانیشیەتی لەوەی نایەوێت، ئەگەر شتی دیکەی بە تۆ ویستبا وەهای ئامادە دەکردی بۆی بشێیت، بێباکیشبوو لەوەی لە چ شیوێکدا تیادەچوویت).

شوێنەواری پێشوازییە گەرمەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر زەیدی خێر، ساڵی نۆهەمی کۆچی بوو، ئەم زەیدی کوڕی موهەلهەلی کوڕی زەیدە لەناو وەفدێکی هۆزی (تەی)دا هاتبوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتبوو: (باسی هەرکەسم لەسەردەمی نەفامیدا بۆ کرابێتو لە سەردەمی ئیسلامدا بینیبێتم سیفەتەکانی لە خوار سیفەتی تۆوە بووە) ناویشینا زەیدی خێر، پارچە زەوییەکیشی پێبەخشی بۆیشی نووسی، ئیتر ئەو گەڕایەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر زەید لەم گرانەتای مەدینە قوتاری دەبوو، ئەوا، دەڵێت: گرانەتاکە لە نزیك ئاوێك پێیان دەوت (قیرەدە) لێیدا و هەر لەوێدا مرد.[1]

---

[1] سەیری الاصابة لابن حجر العسقلاني بکە، ٥٧٣/١ وأخرجه البيهقي في دلائل النبوة باب وفد طي منهم زيد الخيل، رقم ٣٠٧٤.

## سێهەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو: ناو زانین و بەخشینی وەسف و نازناوە قورسایی دەروونی ئەم هونەرەی سەرکردە

ناوەکان لای خاوەنەکانیان خۆشەویستن‌و زۆر مانایان بۆ دەگەیەنن، شانازی پێوە دەکەن و دەیکەنە ئەو ناونیشانەی ئاماژە بێت بۆ کەسایەتیان و بەڵگەی سەنگینیان بێت، بۆیە ئیشکردن لەسەر ئەم دەمارە نزیکترین رێگای چوونە ناو دڵەکان و خۆشەویستترینیانە لای دەروونەکان.

رەنگە ئەمە لە رووخساری کەسێکدا کە جارێك پێی گەیشتوویت و یەکترتان ناسیوە بخوێنیتەوە، کاتێك دوای دابڕانێکی درێژ جارێکی دیکە پێی دەگەیتەوە و ناوەکەیت لەبیرچوەتەوە، جا دەزانیت خەڵك چەند ناوی خۆیان خۆش دەوێت و شانازی پێوە دەکەن.

بەڵام گەیشتوویت بە کەسێکیتر دوای ئەو ماوە درێژەی دابڕان ناوەکەیت بیردەکەوێتەو یەکسەر زەردەخەنەیەك بە روخسارییەوە دەبینیت، خۆئەگەر ناو نازناوەکەیشت بیرکەوتەوە ئەو کاتە توانای شاردنەوەی زەردەخەنە درێژەکەی نییە، جا ئەگەر هەڵوێستەیەکی جوان کە لە نێوانتاندا روویداوە باس بکەیت، ئەوکات هەر داوایەکت لێکرد لە هەموو وەختێکی تر خێراتر داواکەت جێبەجێ دەکات.

## خەڵك بۆ پێیا نخۆشە ناویان لەبەر بکرێت

چونکە مرۆڤ ناوەکەی خۆی خۆش دەوێت و شانازیشی پێوە دەکات، بۆیە ناولەبەرکردن و سیفەت و نازناو پێبەخشین، ڕێگەیەکی کورتە کە دڵەکان کەمەندکێشکا و دەروونەکان داگیر بکات، سەرکردە مەزنەکەش لە گرتنی ئەم ڕێبازەدا کارامە بوو.

جار ئەو سەرکردە (ﷺ) چەند ناونیشان و نازناوی بەخشی و چەندین ناوی نەفامیی گۆڕی کە مانایەکی ناشیرین و رووشێنەریان هەبوو.

بەخشینی نازناوو ناونیشان کورتترین ڕێگای چوونە ناو دڵەکانە، عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت: (سێ شت خۆشەویستی براکەت دەستدەخات، کە پێی گەیشتی سەلامی لێ بکەیت، جێگەی بۆ بکەیتەوە لە مەجلیسدا، بە خۆشەویستترین ناوی خۆی بانگی بکەیت).[1]

چەند نموونەیەك ئەهێنینەوە کە ئەو مەبەستە بسەلمێنن، جا دەزانیت پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند پەرۆشبووە کاتێك دەگەیشت بە کەسێك و ناوی دەزانی، چەندیش ناو و نازناوی جوان و شیرینی پێدەبەخشین.

---

[1] أخرجه البيهقي عن عمر مرسلاً في شعب الإيمان مجلد/٦، رقم ٢٩٣١.

## جثامە ( مۆتەکە )

عائیشە ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) کە لە ماڵی مندا بوو پیرەژنێك هات بۆ لای، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: تۆ کێیت؟ وتی: من (جثامە) مۆتەکەی موزەنیم، فەرمووی: نا، تۆ (حسانە) جوانی موزەنیت، ئێوە چۆنن؟ حاڵتان چۆنە؟ لە دوای ئێمە چیتان لێهات؟ وتی: بە باوكو دایکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا باشین، کە ئەو ڕۆشت وتم: ئا بەو شێوە گەرمە پێشوازیت لەو پیرەژنە کرد؟ فەرمووی: لە سەردەمی خەدیجەدا سەردانی دەکردین، وە فاداریش لە ئیمانەوەیە.[1]

سوودلێوەرگرتنی:

ئەگەر دەتەوێت خەڵك دەستخەیت و دڵیان رابکێشیت، ئەوا لە یەکەم بینینیاندا پرسیاری ناو و نازناوی لێ بکە، دڵنیاشبە ئەم یەکترناسینە بەسە بۆ دروستبوونی پەیوەندییەکی گەرموگوڕ و هاوڕێیەتییەکی باش.

## رجال السمرة ( پیاوانی ژێر درەختەکە )

جوانی پیاهەڵدان و شیرینی نازناو زاڵ دەبن بەسەر بەهێزترین حەزی مرۆڤایەتیدا، لەوانەش ئارەزووی مانەوەی هەمیشەیی کە حەزێکی مرۆیی بنەڕەتییە بۆ مانەوە و پاراستنی ژیانی مرۆڤ و بەردەوامبوونی شارستانییەت، مرۆڤی لەسەر گۆشکراوە، چونکە ناو نازناو لە دەروونی

[1] أخرجه الحاكم في مستدركه في كتاب الإيمان، رقم : ٣٩ وقال : هذا حديث صحيح.

خاوەنەکانیاندا پێگەیەکی هەیە، ئاخر ئاماژەیە بۆ کەسایەتی و قەوارەیان.

جا کاتێك ئەو پیاهەڵدانە جوانە دەدرێت بە گوێی مرۆڤدا، یان ئەو نازناوە شیرینە ئەوەندە کەمەندکێشە مرۆڤ لە سایەیدا ترس‌و تەماح و حەزکردن لە سەلامەتی و خۆشەویستی ژیانی بیردەچێتەوە.

﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئاً وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾ (التوبة : ٢٥).

لە مەیدانی ناڕەحەتی و سەختیدا مرۆڤ لە دوی خۆقوتارکردن دەگەڕێت، بەهۆی حەزکردن لە ژیانەوە دەروونەکان بەدوای سەلامەتی دەگەڕێن، هەر ئا لەو مەیدانەشدا نهێنی سەرکردەیی و شێوازەکانی کاریگەریی دروستکردن دەردەکەون. لە سەرەتای جەنگەوە خەڵکەکە بینیان تیر وەك باران بەسەریاندا دەبارێت و دوژمنان وەك سەپان دروێنەی چواردەوریان دەکەن، کەوتنە خۆقوتارکردن، خۆیان دەدایە پاڵ درەخت و تەپۆڵکەکان بە ئومێدی سەلامەتی.

## سەرکردە بانگی پەرتەوازەکان دەکات

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: (کە گەشتینە شیوی حونەین پرش‌و بڵاوبووین، تا دەڵێت وەڵڵاهی کە هۆشمان هاتەوە چواردەورمان گیرابوو، دوژمنان بە یەکدەست‌و کوتوپڕ کەوتنە لێدانمان، خەڵکەکە کەوتنە هەڵاتن و کەس ئاگای لە کەس نەما، پێغەمبەری خوا (ﷺ)

بەلای راستدا لایکردەوە و پاشان فەرمووی: خەڵکینە وەرن بۆ لای من، وەرن بۆ لام من پێغەمبەری خوام، من موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵام، دەڵێت: حوشترەکان نەدەگێرانەوە و خەڵك بۆی دەرچوون).[1]

## بانگەوازی گشتی

بانگەوازەکە لێرەدا گشتییە (خەڵکینە) (أيها الناس) هەموو خەڵکەکەیە ئەوانەی لە موسڵمانبووندا پێشکەوتبوون، ئەوانەش دواکەوتبوون، ئەوانەی کۆچیان کردبوو ئەوانەش شەرەفی کۆچکردنیان لەدەستچووبوو، ئەوانەی بەشداری بەدر بووبوون، سوارچاکەکانی مەککە و پاڵەوانەکانی مەدینە، نووسەرانی وەحی و جگە ئەوانیش، وەسفەکە هەموویان دەگرێتەوە، کەسیان جیاناکاتەوە، کەواتە دەبێت ئەم بانگەوازە چ کاریگەرییەك لە دڵی پەرتەوازەکاندا بەجێ بهێڵێت.

## سەرکردەی وریا

عەباس دەڵێت: (جا پێغەمبەر (ﷺ) وتی: عەباس هاواری پیاوانی ژێر درەختەکە بکە، منیش کابرایەکی دەنگ بەرز بووم، بە هەموو توانایەك هاوارمکرد: ئەی هاوەڵانی ژێر درەختەکە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانی بەو بانگەوازە گشتییە وەڵامدانەوەی خەڵك لاوازە جا بە سەرنجی وردی خۆی و وریایی خۆی تێگەیشت کە

[1] أخرجه أحمد في مسنده رقم ١٤٧٥٩.

پێویستە وەسفەکە تایبەت بکات، چونکە دڵەکان حەزیان لە نازناوی خۆیانە و دەروونەکان شەیدای پیاهەڵدانێکە کە لە خەڵکی جیابکاتەوە.

جا فەرمانیکرد بانگی هاوەڵانی درەختەکە بکرێت، ئەوە شەرەفێك بوو ژمارەیەکی زۆری هاوەڵە بەڕێزەکان پێی گەیشتبوون، کە دەگەشتنە هەزار و چوارسەد کەس، کاتێك کوشتنی نێرراوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عوسمانی کوڕی عەفان لەناو موسڵماناندا بڵاوبووەوە، ئەوان پەیمانی جەنگاندنیان لەگەڵ بەست.

لەسەر پەیمانبەستنەکەشیان قورئان پیرۆز دابەزی و ئەو شەرەفەی بۆ نووسین و بڕیاری بڕواداریی بۆ دان و ڕەزامەندیی پەروەردگاریانی بۆ بەیانکردن و وادەی سەربەرزی و سەرکەوتن و فەتحیشی پێدان: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً﴾ (الفتح : ١٨).

## شوێنەواری بانگەوازە تایبەتەکە ( هاوەڵانی ژێر درەختەکە )

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: (وەڵامیاندایەوە: ئەوا هاتین، ئەوا هاتین، جا پیاوی وایان تێدابوو دەیویست حوشترەکە زوو ڕێك بخات ڕێکنەدەکەوت، بۆیە بەپەلە قەڵغانەکەی لە ملی دەپچڕاند و شمشێر و تیروکەوانەکەی هەڵدەگرت، پاشان بەرەو دەنگەکە دەڕۆیشت تا سەد کەسیان لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە و بەرەو رووی خەڵکەکە بوونەوە و کەوتنە شەڕکردن).[١]

---

[١] أخرجه البيهقي في دلائل النبوة، رقم ١٨٨.

دەبینن بانگکردن بەو سیفەتە خۆشەویست و نازناوە ئازیزە چ کاریگەرییەکی دروستکرد (هاوەڵانی ژێر درەختەکە)، تەنانەت پیاوی وەهایان تێدا بوو ئەگەر وڵاخەکەی بە قسەی نەکردایە، قەڵغانەکەی کە دەیپاراست فڕێیدەدا تا باری خۆی سووك بکات و لە حوشترەکەی دادەبەزی و بەرەڵای دەکرد تا بەدەم بانگەوازەکەوە بچێت و وەڵامی بداتەوە، هەر ئەو کەسە پێش چەند ساتێك خۆی لادەدا و پشتی هەڵکردبوو و قامچی لە حوشترەکەی دەدا تا لە مەیدانی شەڕ و مەترسییەکە دووری بخاتەوە.

ماشەڵڵا ئەم بانگەوازە چ کاریگەرییەکی قووڵی کرد لە دەروونی هاوەڵە بەڕێزەکان، هەموو شتێك وەرگەڕا بە یەك دەربڕین و یەك پیاهەڵدان (ئەی هاوەڵانی ژێر درەختەکە) بەم وەسفەو بانگەوازە هەرچی ترس‌و دوودڵی هەبوو رەوینەوە، جەربەزەیی و ئیمانبەهێزی شوێنیانی گرتەوە و دەروونەکان ئازایەتی پاڵەوانەکان و غیرەتی مەردەکانیانی دەرخست.

حەزی ژیان نەماو حەزی جیهاد جێگەی گرتەوە، بەیەك دەربڕین، قورئان لە ئاسمانەوە دانەبەزی، فریشتەش نەهاتە خوارەوە، تەنها دەربڕینی بانگەوازەکە بەس بوو، بۆ بەرپاکردنی ئەم وەرچەرخانە خێراو فراوانە، لە خۆپەنادان بە نیازی سەلامەتیەوە بۆ گەڕانەوە مەیدان کە ئەگەری کوشتنی تێدایە، کەواتە ئایا دەرسمان لێوەرگرت، لەو هێزە تێگەیشتین کە ناوێکی جوان یان پیاهەڵدانێکی شیرین و نازناوێکی ئازیز بەرپای دەکەن.

## کۆتایی چیرۆکەکە

عەباس دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر ئەسپەکەیەوە بۆیانچوو، فەرمووی: شەڕەکە گەرمبوو، دەی عەباس پێشکەوە، ئینجا هەندێك وردە بەردی هەڵگرت و فڕێیدان و فەرمووی: سوێند بە خوای کەعبە تێکشکان).[1]

## دروشمی رۆژی یەمامە

عوروەی کوڕی زوبێر دەڵێت: دروشمی موسڵمانان لە رۆژی شەڕی موسەیلەمەدا: (ئەی هاوەڵانی سورەتی بەقەرە)[2] بوو.

## ناو دیار نەما و نازناو جێگەی گرتەوە

لە زۆربەی خەڵك بپرسیت عەبدوڕەحمانی کوڕی سەخری دەوسی کێیە؟ وەڵامەکەی نازانن، بەڵام ئەگەر بزانن ناوی هاوەڵێکە کە هەموو کەس بە نازناو دەیناسێتەوە پێدەکەنن، چونکە ناوەکەی نازانن و بەنازناوێك بەناوبانگە کە دیاری پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

## نازناوێك ناوەکە دادەپۆشێت و رەچەڵەکەکەشی دەسڕێتەوە

ئەبو هورەیرە دەڵێت: (سوێند بەو خوایە کە جگە لەو هیچ خوایەکی دیکە نییە، لە برسێتیدا کەوتبوومە سەر زەوی، بەردم لە سکم بەستبوو لە تاوا، جارێك لەو سەرە رێگایەی کە لێوەی دەچوون دانیشتم،

---

[1] أخرجه الحميدي في مسنده، رقم ٤٤٦.

[2] أخرجه ابن أبي شيبة في مصنفه في كتاب الجهاد، باب الشعار، حديث رقم ٣٢٩١٣.

ئەبوبەکر دایبەلامدا، منیش پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێکرد، پرسیارەکەشم هەر بۆ ئەوەبوو شتێکم دەرخوارد بدات، تێپەڕی و وەهای نەکرد، پاشان عومەر دایبەلامدا و پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێکرد هەر لەبەر تێکردنم، ئەویش ڕۆیشت و هیچی نەکرد.

## پێغەمبەری خوا تێدە پەڕێت بزە دەیگرێت

پاشان پێغەمبەری خوا (ئەبولقاسم) (ﷺ) هاتو کە بینیمی بزەیەك گرتی و زانی چی لە دڵمدایە و لە روخسارم تێگەیشت، جا فەرمووی: باوکی پشیلە (یا أبا هر) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دوامکەوە، ئیتر ئەو ڕۆیشت و منیش دوای کەوتم تا چووە ماڵ و دای لە دەرگا و مۆڵەتی بۆ وەرگرتم و چووینە ژوورەوە، جامێك شیری بینی، فەرمووی: ئەم شیرە هی کوێیە؟ وتیان: فلانە پیاو، یا ژن، بە دیاری بۆی هێناویت، فەرمووی: باوکی پشیلە وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بڕۆ بانگی ئەهلی صوفەم بۆ بکە، دەڵێت: ئەهلی صوفە میوانی موسڵمانان بوون و بێ ماڵ و بێ حاڵ و بێ کەسوکار بوون، کە پێغەمبەری خوا زەکاتی بۆ هاتبا بۆی دەناردن و هیچی لێ گل نەدەدایەوە، خۆئەگەر دیاری بۆ هاتبا دەینارد بە شوێنیاندا و بەشی دەدان، منیش ئەمەیانم پێ ناخۆش بوو، لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم شیرە کەی بەشی ئەهلی صوفە دەکات، دەبوو من قومێکم لێ خواردبا و کەمێك هێزم پێدا هاتباوە، کەچی فەرمانم پێدەکات بیاندەمێ دەبێت چی بۆ من بمێنێتەوە؟ بەڵام جگە لە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا و

پێغەمبەر چارێکی دیکەم نەبوو، چووم‌و بانگم کردن و هاتن، مۆڵەتیان وەرگرت و مۆڵەت دران هەریەکە لە شوێنێکدا جێگەی خۆی گرت، فەرمووی: باوکی پشیلە، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بیگرە و بیاندەیە، جامەکەم گرت و دەمدا بە یەکێکیان تا تێر دەبوو لێی دەخواردەوە، جا جامەکەی بۆ دەگێڕامەوە و منیش دەمدا بە کەسێکی تریان ئەویش تا تێر دەبوو لێی دەخواردەوە و جامەکەی پێ دەدامەوە، منیش دەمدا بە کەسێکی تر تا تێر دەبوو، پاشان جامەکەی پێ دەدامەوە، تا هەموویان تەواو بوون، گەیشتە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جا جامەکەی گرت و خستیە سەر دەستی و سەیری منی کرد و بزەیەك گرتی و فەرمووی: باوکی پشیلە، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: من‌و تۆ ماوین، وتم: راست دەفەرمووی، فەرموو: دانیشە بخۆرەوە، منیش دانیشتم و خواردمەوە، فەرمووی: بخۆرەوە، دیسان خواردمەوە، ئیتر ئەوەندە فەرمووی: بخۆرەوە، تا وتم: سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق رەوانەکردووە ئیتر شوێنم نەما تێیبکەم، فەرمووی: جا بیدەوە بە من، منیش جامەکەم پێدا، ئەویش سوپاسی خوای کرد و ناوی خوای هێنا و پاشماوەکەی خواردەوە.[1]

---

[1] أخرجه البخاري في الصحيح في كتاب الرقاق، باب كيف كان عيش النبي (صلى الله عليه وسلم) وأصحابه، رقم ٦١١٠.

# عەكاشە پێشتكەوت

ئەم دەستەواژەیە بووەتە پەندێك هەموو كەس دەیڵێتەوەو چواردە سەدەیە بووەتە پەند بۆ كەسێك بۆ شتێك پێشبكەوێت.

عەبدوڵڵای كوڕی عەباس ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئوممەتەكانم پیشاندرا، پێغەمبەرم دەدیت ئوممەتێكی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریش هەبوو كۆمەڵێك، هەشبوو دە كەس، پێغەمبەری وەهاش بوو پێنج، هی وەهاش هەبوو بە تەنها تێدەپەڕی، جا سەیرم كرد ڕەشاییەكی زۆر هات، وتم: جوبرەئیل ئەمانە ئوممەتەكەی منن؟ وتی: نەخێر، سەیری ئاسۆ بكە، كە سەیرمكرد ڕەشاییەكی زۆرم دیت، وتی: ئەمانە ئوممەتەكەتن، كە حەفتا هەزاری پێشەوەیان هیچ حسابێكیان لەسەر نییە و سزا نادرێن، وتم: بۆچی؟ وتی: چارەسەر وەرناگرن و دوعا ناكەن (مەبەست پشت بە خوا دەبەستن و لە ناخۆشی و نەخۆشی بێ باكن) باوەڕیان بە شومی نییە و پشت بە خودا دەبەستن، جا عەكاشەی كوڕی مەحسین هەستا وتی: لە خوا بۆم بپاڕێرەوە كە من لەوانە بم، فەرمووی: خوایە لەوانە بێت، پیاوێكی تریش هەستاو وتی: دوعا بۆ من بكە كە منیش لەوانە بم، فەرمووی: عەكاشە پێشتكەوت.[1]

ئەمە چ شانازییەكە بۆ عەكاشە كە هەر لە دنیادا ناوی لە هەموو ئەم سەرزەوییەدا و هەتا دنیا دنیایە دەزرنگێتەوە، شانازییەكەی بۆ قیامەت مەزنترە لەناو ئەو خەڵكەدا بەبێ لێپرسینەوە و سزادان دەچێتە

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الرقاق، رقم ٦١٩٨.

بەهەشتەوە. جا بزانە ئەم شانازیی پێبەخشینەی دنیا و دواڕۆژ چ کاریگەرییەکی لە دەروونی عەکاشەدا بەرپاکرد.

ئیبن ئیسحاق لەناو هێنانی شەهیدەکانی بەدردا دەڵێت: عەکاشەی کوڕی موحسین ئەو کەسە بوو کە لە ڕۆژی بەدرا تا دەستی پەڕی شمشێری دەوەشاند، کە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارچە دارێکی دایە دەستی و فەرمووی: عەکاشە بەمە شەڕ بکە، کە لە دەستی پێغەمبەری وەرگرت و رایوەشاند، لە دەستیدا بوو بە شمشێرێکی قەد درێژی دەم تیژی رەنگ سپی، ئەویش تا سەرکەوتنی موسڵمانان شەڕی پێ کرد، لەوەبەدواش هەر لایبوو، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە شەڕەکاندا پێی دەجەنگا هەتا کوژرا، واتە تا جەنگی هەڵگەڕاوەکان لای مایەوە، شمشێرەکەش ناونرابوو : بەهێز.

## ئەبو عومەیر و باڵندەکە

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاکار جوانترین کەس بوو، برایەکم بوو پێی دەوترا: ئەبو عومەیر (وابزانم دەڵێت برای شیریم بوو) کە پێغەمبەر (ﷺ) دەهات دەیفەرموو: ئەبو عومەیر چۆلەکەکە چی کرد؟ (یا أبا عمیر ماذا فعل نغیر؟) ئەو چۆلەکە یاری پێ دەکرد، جار دەبوو کاتی بانگ دەهاتە ماڵمان فەرمانیدەکرد ئەو بەڕەیە کە لە ژێریدا بوو گسکدەدراو ئاوڕشێن دەکرا، ئینجا هەڵدەستا و ئێمەش هەڵدەستاین و بەرنوێژی بۆ دەکردین؟[١]

---

[١] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأدب، رقم ٥٨٧٠.

## متمانە پێکراو

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: خەڵکی یەمەن هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتیان: پیاوێکمان لەگەڵ بنێرە رێبازی تۆ و ئیسلاممان فێر بکات، دەڵێت: دەستی ئەبو عوبەیدەی گرت و فەرمووی: ئەمە متمانەپێکراو (أمین)ی ئەم ئوممەتەیە.[1]

## یارو برامە

سەبارەت بە یەکەم براوادار و هاوەڵی کۆچو دراوسێی غار و قەبر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ئەگەر تەنها کەسێکم لە ئوممەتەکەمدا بە دۆست گرتبا ئەبوبەکر دەبوو، بەڵام ئەو براو یارمە.[2]

## جگەر و جێگە رازی من

ئەنەس دەڵێت: ئەبوبەکر و عەباس بەلای مەجلیسێکی پشتیواناندا تێپەڕین، کە دەگریان، وتیان: بۆ دەگرین؟ وتیان: یادی مەجلیسی نزیکی پێغەمبەرمان لە خۆمان یاددەکردەوە، ئەوانیش چوونە لای پێغەمبەر و هەواڵەکەیان پێدا، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتەدەرەوە و بە پارچە قوماشێك سەری بەستبوو، چووە سەر میمبەرەکە، ئەوەش دواجار بوو بچێتە سەر میمبەر، جا سوپاسو ستایشی خوای کرد و

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه كتاب فضائل الصحابة باب فضائل أبي عبيدة بن جراح، رقم ٤٥٦٦.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، رقم ٣٤٨٤.

پاشان فەرمووی: پشتیوانانتان پێ ڕادەسپێرم، چونکە ئەوان جگەر و جێگە ڕازی منن، ئەوەی ئەرکی سەرشانیان بوو بەجێیان هێنا، ماوەتەوە ئەوەی مافیانە، بۆیە پێشوازی لە چاکەکانیان بکەن و چاوپۆشی لە خراپانیان بکەن.[1]

## دڵنەرمەکان

ئەبو هورەیرە دەڵێت: وەفدێك هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، جا فەرمووی: خەڵکی یەمەن هاتن بۆ لاتان ئەوانە دڵو دەروونناسکترین و نەرمترینن، ئیمان یەمەنییە و حیکمەتیش هەر یەمەنییە، کەشخەیی و فیزکردن هی حوشتردارانە و هێمنی و ڕەزینیش هی ئاژەڵدارانە.[2]

## خۆڵاوی (أبوتراب)

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆ ماڵی فاتیمە و عەلی نەبینی، فەرمووی: ئامۆزاکەت کوا؟ وتی: شتێك لە نێوانماندا ڕوویدا، لێم تووڕە بوو لە ماڵ دەرچوو لای من ئیسراحەتی نەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە کەسێك بزانە لە کوێیە؟ کابرا هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە مزگەوتە و ڕاکشاوە، پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ لای کە پاڵ کەوتبوو، قاچێکی دێرابووەوە لە کراسەکەی

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، رقم ٣٦١٨.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، رقم ٤١٤٥.

و تۆزاوی بوو بوو، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە سڕینی و فەرمووی: خۆڵاوی هەستە، خۆڵاوی هەستە (قم یا أبا تراب).[1]

## سەروەری شەهیدان

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس - خوایان لێ ڕازی بێ - دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: سەروەری شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبە و پیاوێکیشە هەستێتەوە لە بەردەم پێشەوایەکی ستەمکاردا ئەمری بە چاکە پێ بکات و نەهی لە خراپە لێ بکات، ئەویش بیکوژێت.[2]

## سەروەرانی گەنجانی بەهەشت

دوو خونچە و خۆشەویستەکەی سەرکردەی مەزن، هێشتا شیرەخۆرە و کۆرپە بوون و یارییان دەکرد، بوون بە ئازیزی موسڵمانان (حەسەن و حوسەین سەروەرانی گەنجانی بەهەشتن).[3]

## بەندەی خودا و پشتی هۆزەکەی و شمشێرێك لە شمشێرەکانی خودا

ئەبوبەکر دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) باسی خالیدی کوڕی وەلیدی دەکرد و فەرمووی: باشترینی (نِعمَ) بەندەی خوا و پشتی هۆزەکەی و شمشێرێك لە شمشێرەکانی خودا.[1]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الصلاة، رقم ٤٣٢.

[2] أخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب معرفة الصحابة ٤٨٥١ وقال صحيح الإسناد.

[3] أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب اخباره (ﷺ) عن مناقب الصحابة رقم ٧٠٧٧.

# نەوەی نازناوو پیاهەڵدان

سەیر لەوەدا نییە کەسێك وەسفێك بکرێت یان نازناوێکی لێ بنرێت، سەیر ئەوەیە کەسێك کۆمەڵە نازناوێکی لێ بنرێت و بە چەندین شێوە وەسف بکرێت، وەك تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا کە ناونرابوو (تەڵحەی خێر ئەمە لە ئوحوددا، تەڵحەی سەخاوەت ئەمە لە حونەیندا، تەڵحەی بەرەکەت ئەمەیان لە غەزای عەشیرەدا).

هەروەها سەیر ئەوەیە نەوەیەکی تەواوی پیاوان و ژنان وەك نەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی شیرین و نازناوی جوانیان پێ ببەخشرێت.

ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەینەوە و سەیری تۆمار و ناو و ژیانی نەوەی هاوەڵان بکەین دەبینین زۆربەی هەرەزۆریان ناوێك یان نازناوێکی تایبەتی هەیە کە زۆرینەیان سەرکردە و مامۆستای مەزن و کامڵ (ﷺ) پێی بەخشیون، دەی ئەوەی خوێندتەوە چی فێر کردیت؟

ئەمە دەریدەخات کە ئەم سیفەتەی سەرکردە ـ واتە بەخشینی ناو و نازناو ـ سیفەتێکی جێگیر بوو لای سەرکردە مەزنەکە (ﷺ)، کە سیفەتێکبوو لە ناخی دۆستاندا خۆشەویستی چاند و دڵی باوەڕدارانی پڕ کرد لە سۆز، چونکە ناوبانگی جوان ویسامی سەرسنگی ئەوانەیە کە پێی دەبەخشرێت و نازناوی شیرینیش نیشانەیە بە رووخساریانەوە.

---

[1] أخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب معرفة الصحابة رقم ٥٢٧٨.

## بڕوانامەی سوپاسگوزاری

دەزانیت ئەو کەسانەی کە بڕوانامەی ڕێزلێنان و مەدالیای پێزانینیان پێ دەبەخشرێت چی لێدەکەن، بە شوێنێکی بەرزەوە یان بە جێگایەکی دیارەوە هەڵیدەواسن و شانازی پێوە دەکەن و دڵیان پێی خۆشە و بەکارەکەیان شادمان دەبن.

هەرچەندە ئەمانە لەبیردەچنەوە و گوم دەبن بە تێپەڕبوونی کات و ڕۆژگار، بەڵام نازناوی شیرین و پیاهەڵدانی جوان نافەوتێن و مەترسیی بزربوونیان لێ ناکرێت، با خاوەنەکەشی بمرێت، ئەو نامرێت، ئەمانە مانەوەیەکی هەمیشەیی و سەربەرزییەکن وشە نووسیونی، بۆیە سەرکردە مەزنەکە (ﷺ) نازناوی جوان هەڵدەبژێرێت و وەسفی شیرین دەبەخشێت، خۆ ئەمانە هیچی تێ ناچێت، بەڵام بزانە چی بە پێبەخشراوەکە دەکات؟ کەسی وەسفکراو چەند دڵشاد دەکات؟ ئەم پێبەخشینە ناوەکە بە زیندوویی دەهێڵێتەوە و شانازی تۆمار دەکات و پێزانین جێگیر دەکات، مانایەکی جوان لە یادگەدا جێدەهێڵێت، ماشەڵڵا چەند کەمی تێدەچێت و چ کاریگەرییەکی مەزن جێدەهێڵێت.

جا سەرکردە مەزنەکە دەزانێت کە سیفەت و نازناوە جوانەکان لە دەروونی هاوەڵانیدا چ بەهایەك جێ دەهێڵن، بۆیە لە بەخشینیاندا سەخیی تەبیعەت بوو، بەڕاستی سەرکردەیەکی کاریگەر و مەزن بوو.

## گەوهەری محەمەدی

وەسفکردن تامی خۆشەویستی و بنەمای نزیکبوونەوەیە، دەروونی وەسفکراو شیرینیەکەی دەچێژێت و گیانیشی پێ دەحەسێتەوە، باشترین وەسفکردنیش ئەوەیە قووڵ و ریشەداکوتراو بێتو وەکو شاخ نەلەخشێت، جێگیرترینیشیان نازناوێکی بڵند و وەسفێکی بەرزە.

## گەوهەری سێهەم

عەمری کوڕی تەغلیب دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کۆمەڵێکی بەخشی و لە کۆمەڵێکیشی گرتەوە، جا وەك بڵێی گلەییان لێ کرد، بۆیە فەرمووی: من بە خەڵکانێك دەبەخشیم لە لاوازی[1] دڵ و دەروونیان دەترسم، خەڵکانێکیش دەسپێرم بەو خێر و دەوڵەمەندییەی کە خودا لە دڵیاندا بەرپای کردووە، لەوانەش عەمری کوڕی تەغلیب.

عەمری کوڕی تەغلیب دەڵێت: سوێند بە خوا حەزمنەدەکرد لەبری ئەم قسانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوشترگەلێکی رەسەنم پێ بدرایە.

بەڵێ ئەم بڕوانامەی پێغەمبەرێتیە و ئەم بەخششە محەممەدییە لە هەموو دیارییەك باشتر و لە گشت بەخششێك بەنرختر و لەهەرچی زێڕو زیوە گرانترە، سا خودایە درودی خۆت بڕێژی بەسەر محەممەد و بنەماڵە و وەچە و شوێنکەواتووانی.

اللهم ئامین.

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب فرض الخمس رقم ٢٩٩٨.

## سێهەم نهێنی سەرکردە سەرکەوتوو: لەبەرکردنی ناو و پێبەخشینی نازناو و سەخی تەبیعەتییە لە پیاهەڵداندا

﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً﴾ (النساء : ٦٩).

(الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم) (ئەوانەی خوا نیعمەتی بەسەردا ڕژاندوون) بە چوونە بەهەشت.

(مِّنَ النَّبِيِّينَ) (لە پێغەمبەران) باشترین دروستکراو و بژاردەی ناو خەڵك کە خودا هەڵیبژاردوون بۆ گەیاندنی بانگەواز.

(وَالصِّدِّيقِينَ) (راستگۆیان) ئەوانە زۆر راستگۆن و ئاینی خودا دەراستێنن کە باشترین شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانن.

(وَالشُّهَدَاء) ئەوانە کە لە پێناوی خوادا شەهید دەبن.

(وَالصَّالِحِينَ) خاوەن ئیشو کارە باشەکانن.

(وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً) واتە ئەوانە باشترین هاوڕێن.

# بەشی چوارەم
# گفتوگۆ و قەناعەتپێکردن
# لە فەرهەنگی دەروونی مرۆییدا

رەفتاری مرۆیی کە لە قەناعەتێکی ریشەدارییی دەروونییەوە دەربچێت، دەبێتە رەفتارێکی هەمیشەیی و بەردەوام، هیچ رێگایەکیش نییە بۆ چاندنی قەناعەت و نمونەی باڵا و بەها و بیروباوەڕ قووڵکردنەوە جگە لە رێگەی گفتوگۆی هێمن و لەسەرخۆ.

## مۆڵەتدان بە تاوانکردن

ئەبو ئومامە دەڵێت: (لاوێکی نەوجوان هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتی زیناکردنم پێ بدە، خەڵکەکە روویانتێکرد و لێی توورە بوون، وتیان: وس، وس، فەرمووی: نزیکبەوە، کەمێك لێی نزیك بووەوە، فەرمووی: دانیشە، دەڵێت: دانیشت، فەرمووی: ئایا بۆ دایکت پێتخۆشە؟ وتی: نەوەڵڵا خوا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: خەڵکیش هەروا پێیانخۆش نییە بۆ دایکیان، فەرمووی: ئایا بۆ کچەکەت پێتخۆشە؟ وتی: نەوەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا بەقوربانت بم، فەرمووی: خەڵکیش پێیانخۆش نییە بۆ کچەکانیان، فەرمووی: ئەی بۆ خوشکەکەت پێت خۆشە؟ وتی: نەوەڵڵا خوا بمکات بەقوربانت، فەرمووی: خەڵکیش بۆ خوشکەکانیان پێیان خۆش نییە، فەرمووی: ئەی بۆ پورت پێتخۆشە: وتی: نەوەڵڵا خوا بمکات بەقوربانت. دەڵێت: دەستی خستە سەر سنگی و فەرمووی: خودایە لە گوناهی خۆشبە و دڵی پاکژکەرەوە و ناموسی بپارێزە، ئیدی دوای ئەوە ئەو گەنجە بەلای هیچ شتێکدا لای نەدەکردەوە.[1]

[1] أخرجه الإمام أحمد في مسنده، مسند الأنصار، الحديث رقم : ٢١٦٧٦.

## خوێندنەوەی دەقەکە

ئەم گەنجە ناخی پڕ لە بڵێسەی حەز و هەوەس‌و هێزی نێرینەییە، لەولاشەوە باوەڕ و لەخواترسیشی تێدایە. ئارەزوو تینی بۆ هێناوە و ژیانی لێ تاڵ کردووە، دەروونی مرۆڤ حەزی تاقەتپڕووکێن و ئارەزووی لەتوانابەدەری تێدایە، بەڵام ئەم حەزو ئارەزووانە لەترسی کەوتنە حەرام و چاودێری خودایی و جێگیربوونی ئیمان دەتوانرێت جڵەویان نەدرێتە دەست.

لەم ململانێیەدا ئەم لاوە تاقەتی نەما و مەیلی بەلای ئارەزوویدا شکایەوە و ناچار بۆ دامرکاندنەوەی روو لە پێغەمبەری خوا دەنێت و دەیەوێت مۆڵەتی بدات، دەشیزانی حەرامە، بەڵام هات‌و داوای مۆڵەتی تایبەت دەکات، چونکە وایدەزانی لەم سەرزەوییەدا کەس وەك ئەو حەز و ئارەزوو کڵپەی تێدا نەسەندووە و زۆری بۆ نەهێناوە، بۆیە راشکاوانە و بوێرانە دەڵێت: (ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتی زیناکردنم پێ بدە)، ئەمە بەبێ پێشەکی و زەمینەسازییەك.

## هەڵوێستی ئامادەبووان

خەڵکەکە سەرنجی دەدەن و لێی زوویر دەبن، چۆن داوایەکی وەها لە کەسێکی وەها دەکرێت!

داوایەکی زۆر نزم لە پیاوێکی بڵند دەکەیت! مۆڵەتی پیسییەك دەخوازیت لە پیاوێکی خاوێن! کە لێی تووڕە دەبن، مامۆستا هێمنەکە (ﷺ) دەبێتە نێوەندگیر، سەرکردەی پەروەرێن گوێی لە

تووڕەبوونەکەی خەڵکەکە و بێزاریدەربڕینەکەیانە، بۆیە بانگی دەکات و گەنجەکەش کە تووڕەبوون و بێزاری خەڵکەکە دەزانێت خێرا لێی نزیکبدەبێتەوە، پێغەمبەری میهرەبانیش (ﷺ) رووی تێدەکات، ئەو هەرکەسی بدواندایە تەواو رووی تێدەکرد، جا لەگەڵ ئەم گەنجەدا کەوتە گفتوگۆیەکی پلەبەندی کورتی پرسیار و وەڵامێکی ئازادانە، کە جێگەی رامان و بیرکردنەوە بێت.

پەروەرێنە هێمنەکە (ﷺ) چاکی ئەندازەگیری کردبوو، ئاخر ئەمە تۆ دەتەوێت دەروازەی شەڕێکی ناقۆڵایەو ئاگر تێبەردانێکە کە دوایی نەکوژێتەوە و دەرگاکەش داناخرێت، ئیتر دەرروونی لاوەکە ئەو کەیلی و تاسەیەی نامێنێت.

## کەواتە چارەسەر چییە؟

چارەسەر بێدارکردنەوەی عەقڵە بەرامبەر بە حەزو ئارەزوو، ورووژاندنی هیمەتبەرزییە بەرامبەر لاوازی دەروون.

## سەرەتای گفتوگۆکە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ گەنجەکەدا گفتوگۆ بە ئازیزترین و خۆشەویستترین مێینە لەسەر دڵی دەستپێدەکات، بۆیە پێی دەڵێت: بۆ دایکت پێت خۆشە؟ واتە ئەم خراپە نەگریسە کە داوای مۆڵەتی بۆ دەکەیت، ئایا شتێکە بۆ ئازیزیترینی ئافرەت کە دایکتە پێی رازیبیت؟

## بۆچی دایك؟

لە دایكەوە دەستیپێكرد تا هەستی لە باڵاترین ئاستدا ببزوێنێت، وەڵامەكە بە خێرایی و جەختكردن و سوێندی قورسەوە هاتەوە (نەخێر نەوەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا) جۆرێك خۆشەویستیشی تێدا بوو، (خوا بمكات بە قوربانت) وەك بڵێت: نە بەخوا بۆ دایكم پێمخۆش نییە خوا بمكات بە قوربانت ناوی دایكم بهێنیت كە خۆشەویسترین ئافرەتی دنیایە لە دڵما كە هەموو شتێك لەرێی ئەودا بەخت دەكەم.

وەڵامی پێغەمبەریش دیاربوو، كە لە نیازەكەی تێگەیشتووە، كەواتە ئەو غیرەتە زۆرەی تۆ لەسەر دایكت كە بەو وەڵامدانەوە خێرایەدا دەردەكەوێت، هەموو پیاوێكی دیكەش هەر ئاوهان (خەڵكیش بۆ دایكیان پێیانخۆش نییە)، دەیەوێت ئەم لاوە دوورتر لە دەرگاكەی خۆی بڕوانێت و مەترسییەكانی تێبگات.

پرسیارەكە تەنها لەسەر دایك كۆتایی نەهات، چونكە پێغەمبەری پەروەرێن (ﷺ) دەیەوێت دڵو دەروونی گەنجەكە بەتەواوی لەم خراپەیە پاك بكاتەوە، بۆیە پرسیارەكان پەل دەكێشێت بۆ خۆشەویستو نزیكەكانی دیكەی لاوەكە (كچەكەت، خوشكەكەت، پورت،...) كەواتە كە تۆ بۆ خزمە نزیكەكانت قبوڵت نەبێت، خەڵكیش رازی نابن.

باشە لەسەر زەویدا ئافرەتێك هەیە دایكی كەسێك، یان خوشكی یان پوور و كچی یەكێك نەبێت؟

دەی ئەم غیرەتەی تۆ کە بەرچاوت سوور دەکات، خەڵکی دیکەش هەر وەهان، ئەوەی تۆ پێت ناخۆشە ئەوانیش پێیان ناخۆشە.

ئەم وەڵامانە دڵی لاوەکە سارد دەکاتەوە و کاروباری بۆ روون دەکاتەوە، بەڵام هێشتا خلتە و خاڵێکی هەر دەمێنێت، بۆیە مەزنێتی پێغەمبەرێتی دێتە ئاراوە، تا ئەو خلتە و خاڵەش بسڕێتەوە.

(دەستی خستە سەری) رەنگە لەسەر سنگی، یان سەری، یان شانی بێت، ئەو دەستە پیرۆزە بە سۆزەوە لە لەشی گەنجەکە دەخشێت کە پڕە لە تێڕوانینی بە بەزەیی پێغەمبەرێتی، لەگەڵیشیدا دوعایەکی بە کوڵی بۆ دەکات کە ئەو خەیاڵە گوناهاویە و ئەو حەزە تاوانەی لە دڵ دەرچێت (خودایە لە گوناهی خۆشبە و نامووسی بپارێزە).

دەبێت لە دوای ئەمە چی روو بدات؟ هەرگیز دێت بە خەیاڵا یان گومان دەبرێت یان چاوەڕوان دەکرێت، ئەم گەنجە حەزی حەرامێتی لە کەللەیدا بمێنێت؟ یان گوناهو تاوان پاڵی خراپەکردنی پێوە بنێت؟

فەرموون سەیری شوێنەوار و ئەنجامەکەی بکەن.

(ئیتر ئەو گەنجە ئاوڕی بەلای هیچ شتێکدا نەدەکردەوە).

## چوارهەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو:
## گفتوگۆی هێمنانە و ئاخاوتنی قووڵ

ئەو رەفتارە مرۆییانەی لە قەناعەتی قووڵ و ناخەوە دەردەچێت رەفتارگەلێکی هەمیشەیی و بەردەوامن، تەنها رێگایەکیش بۆ چاندنی قەناعەت و ریشەداکوتانی بیروباوەڕ، وتووێژی لەسەرخۆ و هێمنانەیە.

جوانترین و باڵاترین ئەدەبی وتووێژیش گوێڕادێرانی راستگۆیانە و قووڵە، کە دەرفەتی تەواو بەوی دیکە بدرێت رای خۆی دەرببڕێت و ناخی دڵی هەڵڕێژێت، لە بەردەم کەسێکی ئارامو سەقامگیردا، با ئەوی دەریدەبڕێت شاز و نامۆش بن، دەرفەتپێدانی تەواو رێگەیەکی باشە تا شوێنی هەڵە و کەموکورتییەکە دەرك پێ بکرێت.

گفتوگۆ لۆژیکی ژیرەکان و سیفەتی حەکیمانە، باڵاترین رێگەی بەردەوامبوونی پەیوەندی و ناوازەترین بەرنامەی رۆشنبیرکردن و فێرکردنە.

گفتوگۆ وەك نەخش لەسەر دڵان و لەسەر رەفتاریش کاریگەرە، وا لە مرۆڤ دەکات کە گوێگرێکی باش بێت و گۆڕانی بەسەردا بێت و لە تەواوی وێنەکە تێبگات لە هەموو گۆشەکانیەوە لێبڕاوبێت بە پشتبەستن بە تێڕوانینی دۆستو هاوڕێیانی.

جا کێ هەیە پێویستی بە ڕای خەڵکی دیکە نەبێت؟ خۆ مەزنترین مرۆڤ و سەروەری سەرکردە و ژیرترینی عاقڵەکان، گوێی رادەدێرا بۆ خۆشەویستانی و وەڵامگۆی بچووك و لاوازیشیان دەبوو پێش بەهێز و گەورەکانیان، ئەگەر سوودێك یان خێرێکی تێدا ببینیایە.

## گفتوگۆ لە ژیانی سەرکردەدا

خوای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی بە فەرمانپێکردن دەدوێنێت: ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (النحل : ١٢٥)، ئەویش بە باشترین و جوانترین شێوە بوو بە وەڵامگۆی ئەم فەرمانە.

## گوێگرێکی باش

محەمەدی کوڕی کەعب دەڵێت: (دەگێڕنەوە کە عوتبەی کوڕی رەبیعە رۆژێك لە مەجلیسی قوڕەیشییەکاندا بوو، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە ژووری مزگەوتەوە بە تەنها دانیشتبوو، عوتبە وتی: ئەریٚ هۆزی قوڕەیش بۆ نەچم بۆ لای ئەم کابرایە قسەی لەگەڵ بکەم هەندێك شت بخەمە بەردەستی بەڵکو قبوڵیان بکات و ئێمەش رزگارمان بێت؟ وتیان: باشە باوکی وەلید، عوتبە هەستا چووە لای پێغەمبەر (ﷺ) و دانیشت، فەرموودەکە بە درێژی دەگێڕێتەوە، لەوانە: عوتبە پێی وت و ئەوە ماڵ و موڵکمانە و شتی دیکەشی خستیە بەردەم، هەتا عوتبە تەواو بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی باوکی وەلید لێ بویتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەتۆش گوێم لێبگرە، وتم: وادەکەم، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم، حم (١) تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٢) كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٣) بَشِيراً وَنَذِيراً فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ (٤) وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ (٥) قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ

فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ (٦) الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (٧)﴾ (فصلت: ١ـ ٧). پێغەمبەری خوا ئەمانەی دەخوێندەوە عوتبە دەستەکانی خستبووە پشتی و خۆی دابوو بەسەریاندا و بێدەنگ گوێی لێدەگرت، تا گەشتە ئایەتی (سوژدە)، ئیتر سوژدەی بردو فەرمووی: باوکی وەلید بیستت؟ وتی: بیستم فەرمووی: دەی ئیتر تۆ و ئەوە، جا عوتبە هەستا چووەوە بۆ لای هاوەڵەکانی کە هەندێکیان بەوانی دیکەیان دەوت : سوێند بەخوا باوکی وەلید بە روویەکی ترەوە گەڕایەوە بۆ لامان، کە دانیشت وتیان: ها باوکی وەلید چی هەیە؟ وتی: بەڵێ شت هەیە سوێند بە خوا گوێم لە قسەیەك بوو هەرگیز پێشتر وێنەی وام نەبیستووە، سوێند بە خوا نە شیعرە و نە سیحرە، نە فاڵچێتییە، خەڵکی قورەیش بە قسەم بکەن و بیخەنە سەرم، واز لەم پیاوە بهێنن، سوێند بە خوا ئەو قسانەی لەوم بیست شتی گەورەی لێدەکەوێتەوە).[(١)] ئەم وێستگەیە کۆمەڵە ئاماژەیەکی گرنگی لەسەر ئەدەبی گفتوگۆ و دواندن تێدایە.

ئەم سەرکردە بەڕێزە جوان گوێی لە عوتبە گرت، ئەو لە دوای پێشەکییەکی درێژ کە چاوەڕوان دەکرێت کردبنیە بناغە، پێی دەڵێت: کۆمەڵە شتێکت دەخەمە بەردەم، سەرکردەش (ﷺ) بە ئارامی و جوانییەوە کە وتارەکەش تەواو دەکات پەلەی وەڵامدانەوەی نەکرد، بەڵکو لێی دەپرسێت تا دڵنیا بێت لە تەواوبوونی قسەکانی.

---

[١] أخرجه البيهقي في دلائل الإعتقاد رقم ٢٥٠ بنحوه في دلائل النبوة رقم ٥٠٥.

که له لێبوونەوەی قسەکانیشی دڵنیا بوو، وای به باشزانی لەبری وەڵامدانەوەی ئەو خستنەڕووانەی عوتبە خوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی بێت، که رەوانترین و پاراوترین و شیرینترین و بەلەزەتترین وتەیە، بۆیە به دەنگێکی پڕ له ئیمان که سەر و دڵ حەیرانیەتی و دەروونەکان ئارام بکاتەوە، قورئانی بۆ خوێندەوە، پیتێك وەڵامی خۆی نەدایەوە، پاشان به عوتبەی وت: باوکی وەلید بیستت؟ وتی: بەڵێ، دەی ئیتر تۆ و ئەوە، واتە: خۆت سەرپشك بە، تۆ ئەوەی وتت بیستم و منیش هەرچیم وت، تۆش بیستت، ئێستاش تۆ سەرپشك بە، چونکه من راستییەکانم بۆ دەرکەوتووە و ئیشو کارم بۆ روون بووەتەوە.

ئەم نموونە باڵایەی گفتوگۆیە بوو وای له عوتبە کرد ببێتە گوێگرێکی باش، بۆیە شتێکی سەیر نییە که ئەو خزمانەی که چووەوە بۆ لایان پێی بڵێن: باوکی وەلید، محمد جادوی له تۆش کرد.

## سیفەتێکی جێگیر له ژیانی پێغەمبەری سەرکردەدا (ﷺ)

تۆ ئەگەر ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخوێنیتەوە دەبینیت بیسەر و گوێگرێکی زۆرباش بووە، گوێی له هاوڕێ تایبەت و خەڵکە گشتییەکەش دەگرت، گوێی دەگرت بۆ دوژمنترین کەسی و بۆ ماڵ و خێزانیشی، که ژیانی دەخوێنیتەوە نابینیت قسەی به کەسێك بڕی بێت تا لێ نەبووبێتەوە، با قسەکەرەکە نەفامێك یان دوژمنێك تەنانەت گاڵتەجاڕێکیش بووبێت.

# ئافرەتێك مشتومڕ دەكات و ئەم گوێرادەدێرێت

یوسفی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی سەلام دەڵێت: خەولەی كچی سەعلەبە كە ژنی ئەوسی كوڕی سامتی بڕای عوبادەی كوڕی سامت بوو، بۆی گێڕامەوە (سەعلەبە هاتە ژوورەوە لە بابەتێكدا بە رەقی قسەی لەگەڵ كردم و منیش وەڵامم دایەوە، وتی: دەی تۆ لە جێی دایكم بیت، دوای ئەوە رۆشت بۆ مەجلیسی خزمانی، پاشان هاتەوە دەستی بۆ هێنام منیش رازی نەبووم ئەو زۆری هێناو منیش وەك هەر ژنێك زۆر بە پیاوێكی لاواز بهێنێت وامكرد و وتم: سوێند بەو زاتەی گیانی خەولەی بەدەستە نزیكم نابیتەوە تا خودا خۆی نێوان منو تۆ دەبڕێتەوە، جا هاتم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و سكاڵای ئەو ناڕەحەتییەم لا كرد، فەرمووی: مێردتە و ئامۆزاتە، لەخوا بترسە و هاوسەرێكی باشبە، دەڵێت: نەجولام تا خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (المجادلة : ١)، تا دەگاتە كەفارەت، فەرمووی: فەرمانی پێ بكە بەندەیەك ئازاد بكات، وتم: بە خوا بەندەی نییە، فەرمووی: با دوو مانگ لەسەریەك بە رۆژوو بێت، وتم ئەی پێغەمبەری خوا پیرێكی بەساڵاچووە، بۆ رۆژووگرتن ناشێت، فەرمووی: با خواردنی شەست هەژار بدات، وتم ئەی پێغەمبەری خوا نیەتی ئەو خواردنە بدات، فەرمووی: نا ئێمە بە پڕی تەشتێك خورما پشتیوانی دەكەین، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا منیش تەشتێكی دەدەمێ،

فەرمووی: باش دەکەیت، فەرمانی پێ بکە بیانکاتە خێر و بیانبەخشێت.[1]

خوێنەری بەڕێز، ئەو گوێڕادێرانەی سەرکردەت (ﷺ) بینی بۆ سکاڵای ئافرەتێك و قسەوتنی بە مێردەکەی، کە ئەم چاکەی لەگەڵ کردووە، بەڵام ئەو بە خراپە وەڵامی داوەتەوە، کەچی فەرماندە هەر داوای دانبەخۆداگرتن دەکات، پاشان دەگوازێتەوە بە هێمنی بۆ کەفارەتدان، هەنگاو هەنگاو، پاشان بۆ هاوکاری مێردەکەی بە تەشتێك خورما، دوایی ستایشی ژنەکە دەکات بۆ هاوکاریکردنی مێردە هەژارەکەی، دەبێت ئەم گوتوبێژە چەندەی کات لە ژیانی سەرکردەی بانگەواز گرتبێت؟ سەرکردەی کاریگەر ئاوها دەبێت.

خوێنەری بەڕێز هیوادارم پشوودرێژانە ئەم گێڕانەوە ئەدەبیە بە تەواوی بخوێنیتەوە.

## فەرموودەی دایکی زەرع[2]

عائیشە دەڵێت: (یازدە ژن کۆبوونەوە و پەیمانیان دا و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کەسیان هیچ هەواڵێکی مێردەکەیان لە مەجلیس نەشارنەوە.

یەکەمیان وتی: مێردەکەم زۆر گاڵتەجاڕە، لەبەر گاڵتەجاڕییەکەی خەڵك نایەنە ماڵمانەوە، کەچی فشەکەر و لوتبەرزە.

---

[1] أخرجه البيهقي في سنن الكبرى كتاب الظهار، رقم ١٤٢٧١، واخرجه ابن حبان في صحيحه بنحوه في كتاب الطلاق، رقم ٤٣٤٧.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب النكاح رقم ٤٩٠٧.

دووهەم وتی: قسە دوور و درێژەکانی ناگێڕمەوە، (مەبەست پێی زۆر بڵێیە)، چونکە دەترسم هەقی تەواوی پێ نەدەم، لەبەر زۆری و دووردرێژییەکەی، ئەگەر باس کەم دەبێت باسی عەیبە زۆرە ئاشکراو پەنهانییەکانی بکەم.

سێهەم دەڵێت: مێردێکی درێژی بێ خێرم هەیە، ئەگەر بێدەنگیش بم پیایدا هەڵواسراوم واتە: نە مێردێکی بەکارم هەیە و نە بێوەژنیشم.

چوارهەم وتی: مێردەکەم باخی توهامەیە واتە وەك ئەو فێنکە نە گەرمە و نە سارد، من لای ئەو دڵنیام، لە خراپەی ناترسم و لێشی نابێزرێم، واتە چۆن خەڵکی توهامە شەوێکی فێنك بەسەردەبەن مێردەکەی منیش ئاوەهایە.

پێنجەم وتی: مێردەکەم وەك پڵنگە، کە دێتە ژوورەوە کە دەچێتە دەریش وەك شێر، واتە زوو پەلامار دەدات و زۆر دەخەوێت، ئاماژەیە بۆ ئەوەی لای مێردەکەی خۆشەویستە کە دەیبینێت ئارام دەگرێت، پرسیار ناکات چی لە ماڵەکەی دەکرێت کەواتە سەخیی تەبیعەتە.

شەشەم وتی: مێردەکەم کە دەخوات هەموو شتێك تەواو دەکات کە دەشتخواتەوە تا دواچۆڕ ناهێڵێت، کە پاڵیش دەکەوێت لێفە لەخۆی دەپێچێت، دەستی راناکێشێت تا شتێکی دەستکەوێت، مەبەست پێی نەوسنو فرەخۆرە و لە تێکەڵکردنیشدا بێ کەڵکە.

حەوتەم وتی: بێ عەقڵێکی تەوەزەلە هەرچی عەیبە هەیە لەودا کۆبووەتەوە، لێدان دەکات و گوێش ناداتێ لە کوێ دەدات و کوێ بریندار دەکات.

هەشتەم وتی: مێردەکەم وەك کەروێشك نەرم و نۆڵە و بۆنخۆشە، واتە پاکوتەمیزە، چۆنم بوێت وادەکات.

نۆهەم وتی: مێردەکەم کۆڵەکەی ماڵە، کێلانی شمشێرە، (واتە باڵا بەرزە)، خۆڵەمێشی زۆرە لەبەر زۆر ئاگرکردنەوە و میوانداریی، لە مەجلیسەوە نزیکە، لەبەر ڕێز و کەسایەتی.

دەیەم وتی: مێردەکەم ئەو چاکانەی وتتان لەودا هەیە، حوشترێکی زۆری هەیە، بەرەڵایان ناکات بۆ لەوەڕگە، بۆ ئەوەی هەر میوان هات زوو بیانگاتێ و سەریانببڕێت بۆ ڕێزگرتنی میوانەکە، کە گوێیان لە دەنگی دەف دەبێت دڵنیا دەبن میوان هاتووە و ئەوان سەردەبڕێن.

یانزەهەمیش کە دایکی زەرعی کچی ئەکیمەیلی ساعیدەیە وتی: مێردەکەم ئەبو زەرع بوو، گوێچکەکانمی پڕ کردبوو لە خشڵ، ئەوەندە خزمەتی کردبووم قەڵەو بوو بووم، منی لە خێزانێکی هەژار دۆزیەوە، کەچی دەوڵەمەندی کردم (لە مەڕدارییەوە بۆ خاوەن حوشتر) بوومە خاوەنی کشتوکاڵ و دانەوێڵە، لای ئەو هەرچی قسەمدەکرد نەیدەشکاند، تا بەیانی دەخەوتم، واتە خزمەتکارمان هەبوو بۆ ئیشکردن، تا تێر دەبووم دەمخواردەوە.

دایکی ئەبو زەرع، ئەی دایکی ئەبو زەرع چۆن بوو؟ توێشەبەرەکەی گەورە بوو، ماڵەکەشی فراوان بوو (مەبەست دەوڵەمەندی و فەرەحیانە) کوڕەکەی ئەبو زەرع چ کوڕێك بوو؟ جێگەی خەوتنەکەی وەك کێلانی شمشێر بوو، دەستی کاریلەیەك تێری دەکرد.

کچەکەی ئەبو زەرع چ کچێك بوو؟ گوێڕایەڵی باوكو دایکی بوو، پڕ بە کراسەکەی خۆی بوو (لە قەڵەویدا)، مرواریيەکەی ملی لە جوانیدا حەسوودی پێ دەبرد. کارەکەرەکەی ئەبو زەرع چ کارەکەرێکبوو؟ قسەیەکی ماڵی نەدەبردە دەرەوە، لە ماڵەوە خۆراکێکی شپرزە نەدەکرد، ماڵەکەمانی وەك هێلانە پرشو بڵاو نەدەکرد و بە پاکوتەمیسی دەیهێشتەوە.

دەڵێت: بەیانیەك مەشکەمان دەژەند، ئەبو زەرع چووە دەر، ژنێکی بینی دوو کۆرپەی وەك بەچکە پڵنگ لە دەور بوو، بە سەر قەدیەوە بە دوو هەنارەکەی یارییان دەکرد، ئیتر منی بۆ ئەوتەڵاق داو ئەوی هێنا، دوای ئەو منیش مێردم کرد بە پیاوماقوڵێك سوارە و سەفەر دەکات و دەگەڕێت، ئاژەڵێکی زۆری پێداوم، هەر شتێکی بۆ بێت، بەشم دەدات، پێمدەڵێت: دایکی زەرع بخۆ و بیدە بە کەسوکاریشت، دەڵێت: بەڵام بەو هەموو چاکەوە ئەگەر داوای هەرچیش بکەم بمداتێ لە دڵمدا ناگاتە قاپێکی ئەبو زەرع، مەبەست پێی دڵی هەر لای ئەبو زەرعە.

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دەی من وەك ئەبوزەرع بۆ ئوم زەرع چۆن بوو ئاوەهام بۆ تۆ (واتە لە هۆگری و ئولفەت و خۆشەویستییدا)، بەڵام جیاوازییەکە ئەوەیە ئەو تەڵاقیدا و من تۆ تەڵاق نادەم. نەسائی لە گێڕانەوەکەی تەبەرانیدا ئەمەی بۆ زیادکردووە: عائیشە وتی: بەڵکو تۆ لە ئەبوزەرع باشتری بۆ من.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ دڵخۆشکردن و دڵنیاکردنی عائیشە ئەمەی فەرمووە.

## گوێگرتنی ناڕاستەوخۆ

ئەوەی لە ژیانی ئەم سەرکردە مەزنە (ﷺ) ورد بێتەوە دەبینێت ئەو گوێگرێکی باش بوو، ئەم سیفەتەشی دەقۆستەوە بۆ ئاراستەکردن و پەروەردە و کاریگەرێتی.

گوێگرتنەکەشی هەر لەو سنوورەدا نەبوو کەسێك بیدوێنێت یان پرسیاری لێ بکات یان داوایەکی لێی هەبێت، بەڵکو ئەو گوێی دەگرت بزانێت خەڵکی چ دەکەن و لای ئەودا چی دەڵێن، تا ئەوەندەی نەیاندەزانی کە ئەو گوێیان بۆ دەگرێت!

سەیرکە چەند جار خوێندووتەوە (پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لێبوو کابرایەك وەها و وەهای دەوت) گوێی دەگرت بۆ نوێژکردنیان، قورئان خوێندنیان، گۆرانی وتنیان، قسە گشتییەکانیان، لە کاروباری دونیا و دواڕۆژدا.

## قورئان خوێنێك بیری پێغەمبەر (ﷺ) دەخاتەوە

عائیشە دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە قورئان خوێنێك بوو لە مزگەوتدا شەو قورئانی دەخوێند فەرمووی: رەحمەتی خوای لێبێت، فلأن ئایەتو فلأن ئایەتی بیرخستمەوە، کە لە فلأن سورەتو فلأن سورەتدا دامناون.[1]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب فضائل القرآن رقم ٤٧٦٨.

## ناوی مەزنی خودا

بورەیدی کوڕی حوسەبی ئەسلەمەی دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە کابرایەك بوو دەپاڕایەوە و دەیوت: "اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا اله الا أنت الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد". فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، سوێند بە ناوە مەزنەکە خوارد کە ئەگەر بەوە بلاڵێتەوە و داوا لە خودا بکرێت وەڵامدەداتەوە و هەر داوایەکی لیّ بکرێت دەیبەخشێت.[1]

## هاوار دەکەنە پەروەردگاریان و پێغەمبەرەکەیان دەیبیستیّ

مەعازی کوڕی جەبەل دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو دەپاڕایەوە و دەیوت: اللهم إنی أسألك تمام النعمه، خودایە من داوای تەواوکردنی نیعمەتت لێدەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تەواوکردنی نیعمەت چییە؟ وتی: دوعایەکم کردووە و ئومێدی خێرم پێیەتی، فەرمووی: تەواوکردنی نیعمەت چوونە بەهەشتو قووتاربوونە لە ئاگر. گوێیشی لێبوو پیاوێك دەیوت: یاذا الجلال والإکرام، فەرمووی: دوعاکەت گیرابوو داوا بکە، گوێیشی لە پیاوێك بوو دەیوت: خودایە داوای خۆگریت لێدەکەم، فەرمووی: داوای بەڵا لە خودا دەکەیت، دە داوای سەلامەتی لیّ بکە.[2]

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه رقم ٣٤٧٥ درەجەکەی حسن غريب، لای ئەلبانیش صەحیحە.

[2] أخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح رقم ٣٥٢٧، قال: حديث حسن.

## گۆرانی شایی

عائیشه دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بەلای ژنگەلێکی ئەنساریدا کە لە شاییدا بوون تێپەڕی گۆرانییان دەوت:

واهدى لها كبشاً تنحنح فى المربد

وزوجك فى النادى ويعلم ما فى الغد

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تەنها خوا دەزانێت سبەی چی دەبێت.[1]

بەیهەقی ئەمەی بۆ زیادکردووە: وا مەڵێن: بڵێن: "أتيناكم، أتيناكم، فيحينا وحياكم".[2]

## دەنگی عوباد

عائیشه دەڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) شەو هەستا لە ماڵەکەی مندا، گوێی لە دەنگی عوباد بوو لە مزگەوت نوێژی دەکرد، فەرمووی: عائیشه ئەوە دەنگی عوبادە، وتم: بەڵێ، فەرمووی: خودایه ڕەحم بە عوباد بکە.[3]

## ئەدەبی پاڕانەوە

فوزالەی کوڕی عوبەیدی ئەنصاری دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو لە نوێژەکەیدا دەپاڕایەوە، بەڵام ستایشی خودای نەکرد و سەڵاواتیشی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لێنەدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

---

[1] أخرجه الطبراني في المعجم الأوسط رقم ٣٤٩١.

[2] السنن الكبرى في كتاب الصداق رقم ١٣٧٤٨.

[3] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الشهادات، ٢٥٣٥.

ئەمە پەلەی کرد، دوایی بانگیکرد و بەو یان بە کەسێکی تری فەرموو ئەگەر کەسێکتان نوێژی کرد با بە حەمدو سەنای خودا دەست پێبکات، پاشان سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات، دوای ئەوە چۆنی ویست وەها بپاڕێتەوە.

## گەوهەری محەمەدی

خەڵك بەو کەسە ئاسوودە دەبێت باش گوێی لێ بگرێت، ئایا دەزانیت دکتۆری سەرکەوتوو بە چی جیادەکرێتەوە؟ ئایا بە زۆر پێدانی دەرمانە؟ یان بە باسکردنی نیشانەکانی نەخۆشیی و گرنگی دەرمان بەکارهێنانە؟ نەخێر، نەخێر، ئەو دکتۆرەی خەڵك بە پەرۆشەوە دەچنە عیادەکەی ئەو دکتۆرەیە کە گوێ دەگرێت بۆ ناڕەحەتییەکانی نەخۆش، باوەڕبکە ئەگەر بڵێم پێت کاریگەری ئەو دەرمانە باشترە کە دکتۆرێك دەینوسێت جوان بۆ نەخۆشەکەی گوێ بگرێت و لەگەڵ ئازار و ئێشەکانیدا هاوسۆز بێت.

## گەوهەری چوارهەم

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (هەرگیز پیاوێکم نەدیوە سەر بێنێت بۆ لای گوێچکەی پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەر (ﷺ) سەری لادابێت هەتا کابرا سەری بەرز دەکردەوە، نەشمدیوە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کەسێکی گرتبێت و دەستی بەردابێت، هەتا کەسەکە خۆی دەستی بەردەدا. (لفظ الحديث الأصبهاني).[1]

---

[1] أخرجه البيهقي في دلائل النبوة رقم ٢٦٢ واخرج نحوه ابو داود في سننه رقم ٤٧٩٤.

## چوارهەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو
## گوێڕادێرانی قووڵ و گفتوگۆی نەرمونیانە

خوی گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (المجادلة : ١).

(قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا) واتە موناقەشەی مێردەکەیت لەگەڵ دەکات.

(وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ) قسەی خەولەیە کە وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا لاوێتی بردم و سکی دڕیم، تا چووم بەساڵا و منداڵم نابێت، کەچی زیهارم لەگەڵ دەکات، خودایە سکاڵای خۆمت لا دەکەم.

(وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا) واتە: ئەو وتووێژانەی نێوانتان دەبیستێت.

(إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ) هەموو بیستراوێك دەبیستێت و هەموو بینراوێکیش دەبینێت.

# بەشی پێنجەم
# زەردەخەنەی راستگۆیانە
# لە فەرهەنگی دەروونی مرۆییدا

زەردەخەنە... نهێنیەکی دیکەیە و دەسەڵاتدارێکی کاریگەرە.
منداڵێك بە سروشتی پاکی خۆی لێی تێدەگات، دەبینیت ناو بەناو دەیبەخشێتەوە، لەبەردەم زەردەخەنەی ئەو منداڵەدا دەلڕەقترین کەس دەچەمێتەوە، لەبەرەوڕووبوونەوەی زەردەخەنەی ئەو منداڵەدا مۆنو گرژترین کەس نەرمونیان دەبێت.

## ئەو سیفەتەی هەرگیز لە فەرماندە نەدەبڕا

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نێردرا، چووم بۆ لای، فەرمووی: جەریر بۆچی هاتووی؟ وتم: هاتووم ئەی پێغەمبەری خوا تا لەسەر دەستی تۆ موسڵمان بم، دەڵێت: عەباکەی بۆ راخستمو پاشان رووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: ئەگەر رێزداری هۆزێك هات بۆ لاتان رێزی لێ بگرن ـ فەرموودەکەی هەموو گێڕایەوە ـ کە تیایەتی دەڵێت: لەدوای ئەوە لە هەرکوێ بمیبینایە بە روومدا خەندەی دەکرد.[1] هەر لە ئەوەوە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەوە موسڵمان بووم رێگەی بینینی لێ نەگرتووم، هەرکاتێکیش بینیبێتمی لە روومدا پێدەکەنی، سکاڵای خۆمم لا کرد وتم بەسەر ئەسپەوە خۆم پێناگیرێت، دەستی کێشا بەسەر سنگمدا و فەرمووی: خودایە راگری بکە و بیکە بە هیدایەتدراو و هیدایەتدەریش.[2]

## خوێندنەوەی دەقەکە

جەریر لەو پیاوانە بوو درەنگ موسڵمان بوو، ئەوکاتە دەوڵەتی ئیسلامی گەیشتبوو یان خەریکبوو دەگەیشتە ئەوپەڕی شکۆ، بەوەفدی دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەرکە دەیبینێت بە روویدا خەندە دەکات، جەریر شەرەفی کۆچکردنی لەدەستچوو بوو، هەروەها

---

[1] أخرجه البيهقي في سنن الكبرى كتاب القسامة رقم ١٥٥٥٥.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح كتاب الجهاد والسير، ٢٨٩٥،

شەرەفی غەزای بەدرو غەزاکانی دوای بەدریش، کەواتە نهێنی ئەم خەندەیە دەبێت چی بێت؟

خۆ دورگەی عەرەبی هەمووی کەوتە ژێر رکێفی پێغەمبەر (ﷺ) مەککەش فەتحکراوە و دەوڵەتی ئیسلامی بەرقەرارە، لەم وەختانەشدا قوربانییدانی گەورە تەواو دەبێت و هەلۆیستی سەخت نامێنێت، کەواتە پێغەمبەری خودا (ﷺ)) دەبێت چی لە جەریر بوێت؟ بۆچی هەر دەیبینێت زەردەخەنە دەکات؟!

لەڕاستییدا مانگەکانی کۆتایی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دەروونی زۆر سەخت بوو، چەند ئەزموونێکی نوێی بینی، وەك: نامەنووسین بۆ پاشاکان، یەکەم رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ رۆمەکان لە موئتەدا، لەگەڵ ئەو ناڕەحەتییانەی بەدواییدا هات، وەك شەهیدبوونی سەرکردە گەورەکان لەو جەنگەدا، هەروەها ئامادەکردنی سوپای (عوسرە) و دەرچوون بۆ جەنگ لە چلەی هاوین و قرچەی گەرمادا، ئەو ژاوەژاو و فرتوفێڵانەی لە پێش ئەوان و لەدوای ئەوانەوە مونافیقان بەرپایان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئەزموونانەی بڕی، بەڵام ماندوو شەکەت بوو بوو، هەموو ئەرکەکانی سەرشانی بەجێهێنا و ئەوی لە توانایدا بوو کردی تا وای لێهات لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا بە دانیشتنەوە نوێژەکانی دەکرد.

عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێت: وتم بە عائیشە: (ئایا پێغەمبەر (ﷺ) بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ دوای ئەوەی خەڵك

شەکەتیانکرد).[1] موسڵمانبوونی جەریر ماوەیەکی کەم پێش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، جەریر دەڵێت چل ڕۆژ بەرلە وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمان بووم.[2]

لەو ماوەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو نەخۆشینەی گرت کە پێی مرد، کەواتە جەریر چۆن ئەو خەندە هەمیشەییەی بە قسمەت بوو؟ پێغەمبەر (ﷺ) چ دەروونێکی هەبووە؟ چ خاوەن لوتفـو سۆزێك بووە؟ ئایا کەسێك چەند ئاکار بەرز و ڕەوشت جوانیش بێت دەتوانێت مانگێك وەك پێغەمبەری خوا بێت (صلى الله عليه وسلم)؟ مانگ نا، دەتوانێت ڕۆژێك وەك ئەو بێت؟ چ زەردەخەیەکی گەشاوە روخساری ئەو مامۆستا ڕێنیشاندەرە دادەگرێت؟ دەبێت چ شادی و خۆشییەکی لە دڵەوە بەخشیبێت بەو خەڵکە؟

زەردەخەنەیەك کە جەریری وریاکردەوە و هەمیشە یادی دەکاتەوە (هەرکات پێغەمبەرم دیبێت بەروومدا پێکەنیوە)، ئەمە لای جەریر لە هەموو یادەوەرییەکان خۆشتر بووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) (هەر قسەیەکی دەکرد لە قسەکردنەکەیدا دەم بە خەندە بووە).[3]

(پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو کەس زیاتر پێدەکەنی و دەروون خاوێنتر بوو).[1]

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، رقم ١٢٥٤.

[2] أخرجه ابن خزيمة في صحيحه في كتاب الوضوء، رقم ١٨٨.

[3] أخرجه الطبراني في مكارم الأخلاق، رقم ٢١.

## هونەری پێنجەمی سەرکردەی سەرکەوتوو: زەردەخەنەیەکی پرشنگدار و دەروونێکی ئاوەڵا پێگەی دەروونی ئەم نهێنییە لە ژیانی سەرکردەدا

خەندە... بەدەسەڵاترین هێزی لەسەر گیان و دەروون هەیە، کورتترین رێگای چوونە ناو دڵ و نزیکترین دەرگای چوونە ناو ناخەوەیە.

خەندە... پێکەنینێکی سووكو کردنەوەیەکی هێواشی دوو لێوە.

خەندە... نهێنییەکی دیکە و دەسەڵاتێکی زاڵە، منداڵێك بە سروشتی پاکی خۆی لێی تێدەگات، دەبینیت ناو بەناو دەیبەخشێتەوە، لەبەردەم زەردەخەنەی ئەو منداڵەدا دڵڕەقترین کەس دەچەمێتەوە، لەبەرەو رووبوونەوەی زەردەخەنەی ئەو منداڵەدا مۆن و گرژترین کەس نەرمونیان دەبێت.

زەردەخەنەی راستەقینە ساختە ناکرێت، وەك زێڕی خاڵس وایە ئەگەر خەڵکی ساختەچیش هەوڵی تەزویرکردنی بدات، پرشنگی زێڕەکە هەرزوو دەردەکەوێت کە وەك هیچ پرشنگێکی تر نییە، بەهەمانشێوەش جادووی زەردەخەنەی راستەقینە وەك هیچ جادوویەك نییە.

زەردەخەنە... پرشنگدانەوەی ناخە و والآبوونی دەروون و رەنگدانەوەی ناو دڵە.

---

[١] أخرجه الطبراني في المعجم الكبير، باب الصاد، رقم ٧٧٢٨.

زەردەخەنە... سارێژی ئازار و دەرمانی دەڵتەنگییە.

زەردەخەنە... ئاوێنەی ناخە.

ئەو رووخسارانەی لە ئاوێنەدا دەردەکەون لە روو، رەنگدانەوەی وێنەی ناوەوەی کەسەکە و ئاوێنەی راستەقینەی گیانیەتی.

زەردەخەنەی پرشنگدار، بەهێزترین یاسای راکێشانی دڵو گیانە، زەردەخەنە جادوویەکی کێشکەری هەیە دڵان کەمەندکێش دەکات، لێو بەخەندەکان خولڵکیان لە هەموو کەس خۆشتر و دەروونیان لە هەمووان ئاسوودەترە.

زەردەخەنە بەرانبەر دەوڵەمەند دەکات و بەخشەریش هەژار ناکات، ئەگەر سەروەتت نییە، دەی لە رووخۆشی و خەندەی لێوت ببەخشەوە.

## زەردەخەنەی چینیەکان

(ئەو پیاوەی نەزانێت دەم بە خەندە بێت نابێت بازرگانییەکی هەبێت) چینییەکانیش خاوەنی بازرگانین، مەگەر بانگخواز و قازی و زانا و مامۆستاکانیش بازرگانی بە قازانج نین؟[1] دەیانەوێت بچنە ناخی خەڵکەوە تا کاڵاکەیان لیَ وەربگرن و حیکمەت و شتە باشەکانیان لیَ بکڕن!

[1] ئەمە مانای ئەو ئایەتەیە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ * تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (الصف : ١٠ـ ١١).

کەواتە ئەرکی هەموو خاوەن کاڵایەکە لێو بەخەندە بێت، جا چۆن دەبێت کەسێك خەڵك فێر بکات یان بانگی خەڵك بکات بۆ لای خوا یان پێشەوایەتی بکات و ئیشێکیان بۆ بکات دەموچاوی گرژ بکات و برۆکانی بەیەکدا بدات.

## چۆن خەندە دەکەیت؟

دوو لێوت لەیەك دووربخەرەوە با دانەکانی پێشەوەت بدرەوشێتەوە، چاوەکانیشت پڕکە لە ڕەزامەندی و ناخیشت شادی رووی تیٚ بکات.

## خەندە

عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جوزئی دەڵێت: (کەسم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا زیاتر بەخەندە بێت).[1]

عەبدوڵڵای کوڕی حارس زۆر ژیاوە و خەڵکێکی زۆری بینیوە، کەچی موحەممەد پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموویان زیاتر دەم بە خەندە بووە، کەواتە پەندت وەرگرت؟

## زەردەخەنەی سەرکردە

کردنەوەی لێوەکانی و بێگەردی و سپێتی ددان بە هێواشی و لەخۆبوردەییەکی ڕێزدارانە، نیشانەی پاکێتی خاوەنەکەیان بەرەو ئاسمان بەرز دەکەنەوە، عەبدوڵڵای کوڕی حارس دەڵێت: (پێکەنینی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها زەردەخەنە بوو).[2]

---

[1] أخرجه الترمذي في سننه كتاب المناقب، رقم ٣٧٠٠.

[2] أخرجه الترمذي في سننه كتاب المناقب، رقم ٣٧٠١.

## دەم بە و خەندە پێکەنین

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) نەرمترین کەس بوو، بەرێزترین کەس بوو، ئەویش هەر پیاوێك بوو وەك پیاوەکانی ئێوە، بەڵام ئەو هەمیشە دەم بە پێکەنین و زەردەخەنەبوو.[1]

## بە روخساری گەشت خێر بکە

ئەبو زەڕی غەفاری دەڵێت: پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: زەردەخەنەت بەرووی براکەتدا خێرە، فەرمان بە چاکە و نەهیکردنت لە خراپە خێرە، رێنماییکردنی پیاوێکی بزربوو خێرە، پیشاندانی رێگا بە نابینایەك خێرە، لادانی بەرد و دڕکێك پارچە ئێسقانێك لەسەر رێگا خێرە، گرتنی دۆڵچە ئاوێك لە دەستی براکەت و خاڵی کردنی خێرە بۆت).[2]

## رووگەشی

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ئێوە ماڵ بەخشینتان بەشی هەموو خەڵك ناکات، بەڵام رووگەشی و رەوشتی جوانتان بەشیان دەکات).[3]

---

[1] انظر مكارم الأخلاق لابن أبي دنيا رقم ٣٨٩، وقد ضعفه الألباني.

[2] أخرجه ابن حبان في صحيحه كتاب البر والإحسان رقم ٥٣. وأخرجه الترمذي باب ما جاء في صنائع المعروف رقم ١٩٤٩.

[3] أخرجه البيهقي في شعب الإيمان رقم ٧٨٠٣.

## پێغەمبەری دەم بە خەندە

پێغەمبەری سەرکردە لە هەموو کەس خۆش خولکتر بووە و لە هەموانیش زیاتر رووخسار گەشتر بووە، دەم بەخەندەترینیشیان بووە، لە پێکەنیندا زۆری لە خۆی نەدەکرد و بەزۆریش زەردەخەنەی دروست نەدەکرد، بەڵکو دەروونی هاوەڵانی بە بزەیەکی گەش‌و پێکەنینێکی هێمنانەی لەسەرخۆ خۆش دەکرد.

## جا پێغەمبەری خوا زەردەخەنەیەکی کرد

ئەگەر لاپەڕەکانی ژیانی پێغەمبەری پەروەرێن هەڵدەیتەوە زۆرت پێ سەیر دەبێت لەو هەموو گێڕانەوەیەی دەڵێن: (جا پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی کرد)، ئەوەندە ئەمە دووبارەبووەتەوە وا دەزانیت هەرگیز ئەبرۆکانی بەیەکدا نەداوە.

## پیاوێك بوو ناڕەحەتی نەیدەگۆڕی

ئەم سەرکردە مەزنە کە وەفاتی کرد، بەڵای گەورە و ناڕەحەتی زۆری بەسەردا هاتبوو، کەچی روو خۆشیەکەیان کەمێکیش لێڵ نەکردبوو، شوێنەواری غەم‌و خەفەت هەرگیز بە رووخساریەوە نەدەبینرا، هەمیشە زەردەخەنە بە لێویەوە بوو، لە خۆشی و ناخۆشی و رەحەتی و ناڕەحەتیدا، لە میحراب و لە سەر میمبەر، لە ئاشتی و لە شەڕ، لە شارە بۆنخۆشەکەی بوایە یان لە گەشت‌و گەڕان، تەنانەت لەسەر جێگەی نەخۆشی و کاتی نزیکبوونەوەی ئاکامیش.

## له بەیانیاندا جوانترین خەندە

بەیانیان زوو وێنەی راستەقینەی ناخی مرۆڤ دەردەکەوێت، کە رەنگدانەوەی بێگەردێتی گیانی مرۆڤە، جا ئەگەر هەر له بەیانییەوە گیان بەر له خۆر پرشنگی دایەوە و رووناکی دەرکەوت، پێمبڵێ دەبێت کە خۆر کەوت و دنیا رۆشنبووەوە دەبێت ئەو چی لێ بێت؟ ئەمە پرشنگی گیانە. سەماکی کوڕی حەرب دەڵێت: وتم بە جابری کوڕی سەمرە: ئایا لە مەجلیسی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەبویت، وتی: بەڵێ زۆرجار بەیانیان لە شوێنی نوێژەکەی نەدەبزوا تا خۆر دەکەوت، کە خۆریش دەکەوت هەڵدەستا، هاوەڵان باسی سەردەمی نەفامییان دەکرد و پێدەکەنین، پێغەمبەریش زەردەخەنەی دەکرد).[1]

## زەردەخەنەی تووڕەکراو

کەعبی کوڕی مالیك سەبارەت بە دواکەوتنەکەی لە غەزای تەبووکدا دەڵێت: دواکەوتووەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کەوتنە مەعزەرەتهێنانەوە و سوێندخواردن، کە هەشتاو ئەوەندە کەس دەبوون، پێغەمبەری خوداش مەعزەرەتەکەی لێوەرگرتن و بەیعەتی لێوەردەگرتنەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکردن، پەنهانیەکەشی دەدایە دەستی خوا، منیش چوومە لای، سەلامم لێکرد، ئەویش بزەیەکی کرد، بزەی تووڕەکراوێك، تا دەگاتە کۆتایی کە دەفەرموێت: تۆ هەستە تا خودا خۆی حوکمت لەسەر دەدات).[2]

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه كتاب الفضائل، ٤٤٠٧.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، رقم ٤١٧٤.

## زەردەخەنەی بانگخوازێك

ئوم قەیسی كچی موحسین دەڵێت: (كوڕێكم مرد زۆر پێی ناڕەحەت بووم و وتم بە مردووشۆرەكە: كوڕەكەم بە ئاوی ساد مەشۆ ئەیكوژی؟ عەكاشەی كوڕی مەحسەن چووە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش خەندەیەكی كردو فەرمووی: خوا تەمەندرێژی كات چی وتووە؟ دوایی ژنێكمان نەدی بە ئەندازەی ئەو تەمەنی كردبێت).[1]

## زەردەخەنەی خانەخوێ

سوهەیب دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) نان‌و خورمای لەبەردەمدا بوو، فەرمووی: نزیكبەوە، بخۆ، منیش دەستمكرد بە خورما خواردن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە چاوت دێشێت و خورماش دەخۆیت؟ وتم: من بە لایەكەی دیكەم دەیخۆم، جا پێغەمبەر (ﷺ) خەندەیەكی كرد.[2]

## زەردەخەنەی وتاربێژ

ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) گرانییەك هات بەسەر مەدینەدا رۆژێكی هەینی كە وتاری دەدا، پیاوێك هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا كشتوكاڵ و ئاژەڵەكان فەوتان، لە خوا بپاڕێرەوە كە بارانمان بۆ ببارێنێت، ئەویش دەستی درێژكرد و پاڕایەوە، ئەنەس دەڵێت: ئاسمان وەك شوشە ساف بوو، كەچی بایەك

---

[1] أخرجه البيهقي في سنن الصغرى كتاب الجنائز رقم ١٨٦.

[2] أخرجه ابن ماجة في سننه في كتاب الطب رقم ٣٤٥٨.

هەڵیکرد و هەورێکی هێنا و کۆیکردەوە، تا باران داباری، ئیتر بەناو ئاوا ڕۆشتینەوە بۆ ماڵ، هەتا هەینیەکەی تر هەر باران بوو، جا هەمان پیاو یان کەسێکی تر هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ماڵەکان رووخان، بپاڕێرەوە لە خوا کە بارانەکە بوەستێت، ئەویش زەرخەنەیەك گرتی و فەرمووی: (بە چواردەورمانا نەك بەسەرمانا) منیش سەیری هەورەکانم دەکرد دڕیان دا و وەك پەرژین چوونە چواردەوری مەدینە).[1] لە سەر میمبەر و لە گەرمەی وتاردا ئەم سەرکردە مەزنە تەفاعول لەگەڵ کەسێکدا دەکات کە وتارە پاراوەکەی پێ دەبڕێت، ئەویش وتارەکەی دەبڕێت و جارێك و دوو جار وەڵامی کابرا دەداتەوە و دەداتەوە و بزە دەیگرێت.

## زەردەخەنەی نەخۆش

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەقیعەوە جەنازەیەکیان ناشتبوو گەڕایەوە لام، من سەرئێشەم بوو، ئەموت: ئای سەرم، فەرمووی: نا عائیشە من وای سەرم، پاشان فەرمووی: چ زیانێك دەکەیت ئەگەر پێش من بمریت، خۆم دەتشۆم و کفنت دەکەم و نوێژت لەسەر دەکەم و پاشان دەتنێژم، وتم: کە واتکرد دوایی دەگەڕایتەوە ماڵەکەی من و دوای ئەوە شاییت لەگەڵ هەندێك لە ژنەکانت دەکرد، جا پێغەمبەری خوا زەردەخەنەیەك گرتی، پاش ئەوە ئەو ئێشەی کە پێی مرد دەستیپێکرد.[2]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، رقم ٣٤١٥.

[2] أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب التأريخ باب مرض النبي (ﷺ)، رقم ٦٦٩٨.

## زەردەخەنەی حاجی

ئەسمای کچی ئەبوبەکر دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچووین بۆ حەج، تا گەیشتینە (عەرج)، لەوێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابەزی و ئێمەش دابەزین، عائیشە لە تەنیشت پێغەمبەری خواوە دانیشت و منیش بە تەنیش باوکمەوە دانیشتم، توێشووی پێغەمبەری خوا و توێشووی باوکم بەیەکەوە بوو، لای خزمەتکارێکی ئەبوبەکر بوون، ئەبوبەکر دانیشت چاوەڕوانی دەکرد تا هات دەبینێت هاتو حوشترەکەی پێ نییە، وتی: کوا حوشترەکەت؟ وتی: دوێنێ گومم کرد، ئەبوبەکر وتی: تەنها حوشترێکت گومکرد؟ دەڵێت: کەوتە لێدانی و پێغەمبەری خوداش زەردەخەنە گرتی و دەیفەرموو: سەیری ئەو ئیحرام لەبەرە بکەن، چی دەکات؟ ئیبن ئەبی زەمە دەڵێت: پێغەمبەر هەر ئەوەندەی دەفەرموو: سەیرکەن ئەو ئیحرام لەبەرە چ دەکات و زەردەخەنەی دەکرد.[1]

## زەردەخەنەی ماڵئاوایی

ئەنەس دەڵێت: موسڵمانان کە لە نوێژی بەیانیدا بوون لە ڕۆژی دووشەممە، ئەبوبەکر نوێژی بۆ دەکردن، پێغەمبەری خوا سەرسامی کردن، بەوەی پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لادا و سەیری دەکردن کە لە ریزی نوێژدا بوون، پاشان زەردەخەنەیەك گرتیی و پێکەنی، جا ئەبوبەکر هاتە دواوە کە بگەڕێتەوە ریزی نوێژخوێنانەوە،، چونکە

---

[1] أخرجه ابوداود في سننه كتاب المناسك رقم ١٥٨٣ وحسنه الألباني.

وایدەزانی پێغەمبەر بۆ نوێژ دێتەدەر، ئەنەس دەڵێت موسڵمانان خەریکبوو بشڵەژێن لە خۆشی دەرکەوتنی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، بەڵام ئەو بە دەست ئاماژەی پێدان کە نوێژەکانتان تەواو بکەن، دوای ئەوە رۆشتەوە ژوورەکەیەوە و پەردەکەشی دادایەوە.[1] إنا لله وانا اليه راجعون.

## جا پێغەمبەر پێکەنی، لە رەمەزاندا سەرجێی کرد

ئەبو هورەیرە دەڵێت: کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: تیاچووم، فەرمووی: بۆ؟ وتی لە رەمەزاندا سەرجێیم لەگەڵ خێزانمدا کردووە، فەرمووی: بەندەیەك ئازاد بکە، وتی: نیمە، فەرمووی: دوو مانگ لەسەریەك بە رۆژوو بە، وتی: ناتوانم، فەرمووی: خواردنی شەست هەژار بدە، وتی: نیمە، جا سەبەتەیەك خورمایان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هێنا، فەرمووی: پرسیارکەرەکە کوا؟ وتی: بەڵێ ئەمەتام، فەرمووی: ئەم سەبەتەیە ببەخشەوە، وتی: جا کێ لە ئێمە موستەحەقترە ئەی پێغەمبەری خوا؟ سوێند بەو زاتەی تۆی بەراستی رەوانە کردووە،ماڵێکم پێ شك نایەت لە ئێمە موحتاج تر! جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێندە پێکەنی تا دانەکانی کاکیلەی دەرکەوتن، فەرمووی: جا بۆ خۆتان.[2]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأذان، رقم ٦٥٩.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب النفقات، رقم ٥٠٧١.

## جوتیارەکەی بەهەشت

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێك قسەی دەکرد و کابرایەکی دەشتەکیشی لە لابوو، فەرمووی: پیاوێکی بەهەشتی مۆڵەتی لە پەروەردگاری وەرگرت کە کشتوکاڵ بکات، پێی فەرموو: ئەی ئەوەی حەزت لێیە لات نییە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام حەزم لێیە کشتوکاڵ بکەم، فەرمووی: تۆوی چاند، خێرا کشتوکاڵەکە پێگەیشت و گەورەبوو، وادەی دروێنەی هات، وەك شاخ بەرز بوو بوو، جا پەروەردگاری فەرمووی: ئەی ئادەمیزاد هیچ تێرت ناکات!

کابرای دەشتەکی وتی: بەخوا ئەو کابرا یان قورەیشی بووە یان ئەنساری، چونکە ئەوان خەریکی کشتوکاڵن، خۆ ئێمەی دەشتەکی خەریکی کشتوکاڵ نین، جا پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی.(1)

## جەنگ

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت: کە پێغەمبەر (ﷺ) پێکەوە دایكو باوکی کردە قوربانم، دەڵێت: کابرایەکی موشریك موسڵمانانی شپرزەکردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێمی وت: باوكو دایکم قوربانت بێت بیوەشێنە، دەڵێت: منیش تیرێکی بێ نووکم بۆ گرت و کێشای بە لایدا و کەوت و عەورەتی دەرکەوت، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە پێکەنی تا دانەکانی ئەملاولای دەرکەوت.(2)

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المزارعة، رقم ٢٢٤٤.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب فضائل الصحابة، رقم ٤٥٥٤.

## ئەبو ئەیوب

ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئەو شەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەفیەی گواستەوە ئەبو ئەیوب لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەردا خەوت، کە بەیانی پێغەمبەری بینی الله اکبری کرد و شمشێرەکەی بەدەستەوە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کیژۆڵەیە تازە بووە بە بووك، تۆ باوك و براو مێردەکەیت کوشتووە، بۆیە من متمانەم پێی نەبوو لەسەر تۆ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و قسەی خێری بۆ کرد.[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) تائیفی ئابڵوقە دا، هیچی لێیان دەستنەکەوت، فەرمووی: ئێمە خوایاربێت دەڕۆینەوە، ئەمە لەسەر دڵی هاوەڵان قورس بوو، وتیان: بڕۆین و فەتحی نەکەین! جارێکیش وتی: دەڕۆینەوە، فەرمووی: دەستکەن بە جەنگ، کە دەستیان پێکرد بریندارییان لێکەوتەوە، جا فەرمووی: ئێمە ان شاء الله دەڕۆینەوە... ئەمجارە قسەکەیان پێ خۆش بوو، جا پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی.[2]

## پێشنوێژی ڕێبواران

عەمری کوڕی عاص دەڵێت: لە شەوێکی ساردی غەزای (ذات السلاسل)دا لە خەودا لەشگران بووم، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم تیابچم، بۆیە تەیەمومم کرد و بەرنوێژی بەیانیم بۆ هاوڕێکانم کرد، ئەمەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە، جا فەرمووی: عەمر بە لەشگرانی

---

[1] أخرجه حاكم في المستدرك في كتاب معرفة الصحابة رقم ٦٨٦٢.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، رقم ٤٠٨٨.

پێشنوێژیت بۆ هاوەڵانت کردووە؟ منیش ڕێگرییەکەم بۆ باس کردو وتم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً﴾ (النساء: ٢٩) ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و هیچی نەوت.[1]

## قەشەیەك دەپرسێت

قەشەیەك لە قەشەکان هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی موحەممەد ئێمە وادادەنێین خودا ئاسمانەکانی لەسەر پەنجەیەك داناوە، زەوییەکانیش لەسەر پەنجەیەك، درەخت لەسەر پەنجەیەك، ئاوو گڵ لەسەر پەنجەیەك، هەموو دروستکراوەکانی دیکەش لەسەر پەنجەیەك، جا دەڵێت من پادشام، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە بە قسەی قەشەکە پێکەنی تا دانەکانی ئەملاولای دەرکەوتن، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (الزمر : ٦٧)[2]

## وەك پادشایەك بەسەر خەڵکەوە

ئەنەسی کوڕی مالیك لە ئوم حەرامەوە دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵەکەی مندا چێشتەنگایەك لە خەو هەستاو پێدەکەنی دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا باوکمو دایکم قوربانت بن چی

---

[1] أخرجه ابو داود في سننه في كتاب الطهارة رقم ٢٩٦ وصححه الألباني.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، رقم ٤٠٨٨.

پێیکەنان‌دی؟ فەرمووی: کەسانێك لە ئوممەتی من سواری دەریا دەبن وەك پادشان بەسەر خەڵکەوە، دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بپاڕێرەوە لە خودا کە من لەوانە بم، فەرمووی: تۆ لەوانەیت.[1]

## خەوپەرژین

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە خەونمدا وامدەزانی سەرم بڕاوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: ئەگەر شەیتان لە خەوندا گەمەی بە کەسێکتان کرد با بۆ خەڵکی نەگێڕێتەوە.[2]

## بە چی پێدەکەنیت؟

سوهەیب دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە دانیشتبوو پێکەنی، فەرمووی: لێمناپرسن بەچی پێدەکەنم؟ وتیان: بە چی پێدەکەنیت؟ فەرمووی: کاروباری موسڵمان جێگەی سەرسوڕمانە، هەمووی بۆی خێرە، ئەگەر ئەوەی حەزی لێدەکات تووشی هات و سوپاسی خودای لەسەر کرد، بەخێر بۆی دەنووسرێ، ئەگەر ئەوەشی پێی ناخۆش بوو تووشی هات، بەڵام ئارامی لەسەر گرت، ئەویش هەر خێرە بۆی، کەسیش هەموو کاروبارەکانی خێر نییە بۆی جگە لە باوەڕدار.[3]

---

[1] أخرجه ابو عوانة في مستخرجه مبتدأ كتاب الجهاد رقم ٦٠١٣.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الرؤيا رقم ٤٣٢٩.

[3] أخرجه الدارمي في سننه في كتاب الرقائق رقم ٢٧٣٥.

## باوەشی پێداکرد و ماچی کرد

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێت: ژنێك کە پیاوەکەی لای نەبوو هات بۆ لای پیاوێك شتی لێ بکڕێت، کابرا وتی: وەرە ئەم پەناوە با بتدەمێ، کە چوو، ماچی کرد و باوەشی پێداکرد، ژنەکە وتی: بەدبەخت پیاوەکەم لێرە نییە، ئەویش وازی لێهێناو لەوەی کردی پەشیمانبوەوە و هات بۆ لای عومەر و ئەوەی کردبووی پێی وت: وتی: بەدبەخت رەنگە پیاوەکەی لای ئەو نەبووبێت، وتی: بەڵێ وابوو، وتی: دە بچۆ بۆ لای ئەبوبەکر و پرسیاری لێ بکە، چوو بۆ لای ئەبوبەکر و باسەکەی بۆ کرد، وتی: بەدبەخت رەنگە پیاوەکەی لا نەبووبێت، وتی: بەڵێ وایە، وتی: دە برۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، رۆیشت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێی بڵێ، چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بۆی باسکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: رەنگە مێردەکەی لا نەبووبێت، وتی: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێدەنگبوو، تا ئەم ئایەتە قورئانییە دابەزی: ﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفاً مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّـيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ (هود : ١١٤) دەڵێت: کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە تایبەتە بە منەوە یان بۆ هەموو خەڵکە؟ عومەر وتی: نەخێر، چاوی خێرت لەسەر نەبێت، ئەمە بۆ خەڵکە بە گشتی، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: عومەر راست دەکات.[1]

---

[1] أخرجه احمد في مسنده في مسند عبدالله بن عباس رقم ٢٣٤٠.

## (بسم الله) بۆ سەرەتا و کۆتایی

ئومەیەی کوڕی مەخشی کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو، کابرایەك خەریکی خواردن بوو، بسم الله نەکرد هەتا پارویەك لە خۆراکەکە مایەوە، کاتێك ئەو پاروەشی برد بۆ دەمی وتی: بسم الله بۆ سەرەتاو کۆتایی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و پاشان وتی: شەیتان بەردەوام لەگەڵی دەیخوارد، بەڵام کە ناوی خوای مەزنی هێنا هەرچی لە سکیدا بوو هەڵیهێنایەوە.[1]

## گەورهەری موحەممەدی

(پێکەنی، زەردەخەنەیەکی کرد، دانەکانی ئەملاولای دەرکەوت)

ئەمانە کۆمەڵە دەستەواژەیەکن هەرکەس ژیانی پێغەمبەری سەرکردەی خوێندبێتەوە شارەزایان دەبێت، رووداو و بەسەرهاتێکیش بخوێنیتەوە چاوەڕوانیانە لە دوایاندا روو بدەن، ئەم دەستەواژانە لە دەروونی هەموو خوێنەرێکیشدا ریشە دادەکوتێت بەهۆی دەروونی خاوێن و رۆح پاکی ئەو حەزرەتە مەزنەوە (ﷺ).

## گەورهەری پێنجەم

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) رەوشت جوانترینی خەڵك بوو، جارێك بۆ پێویستییەکی ناردمی، وتم: بەخوا ناچم، لە دڵیشمدا بوو

[1] أخرجه ابو داود في سننه في كتاب الأطعمة باب التسمية على الطعام، رقم ٣٣٢٤.

بچم، چونكه فه‌رمانی پێغه‌مبه‌ری خودا بوو (ﷺ)، ڕۆشتم هه‌تا گه‌شتمه‌ كۆمه‌ڵه‌ منداڵێك له‌ بازاڕدا يارييان ده‌كرد، كه‌چی پێغه‌مبه‌ری خوا له‌ دواوه‌ باوه‌شی پێدا كردم، سه‌يرمكرد ده‌بينم پێده‌كه‌نێت، فه‌رمووی: ئونه‌يس ڕۆشتی بۆ ئه‌وه‌ی پێموتی؟ وتم: به‌ڵێ، ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا وا ده‌چم.[1]

## پێنجه‌م: هونه‌ری سه‌ركرده‌ی سه‌ركه‌وتوو: زه‌رده‌خه‌نه‌يه‌كی گه‌شی ڕاسته‌قينه‌يه‌

﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكاً مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾ (النمل : ١٩) .

﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكاً مِّن قَوْلِهَا﴾ زه‌رده‌خه‌نه‌ سه‌ره‌تای پێكه‌نينه‌، پێكه‌نينه‌كه‌ی سوله‌يمان، سه‌رسوڕمان بوو له‌ قسه‌ و تێگه‌يشتنی مێرووله‌كه‌و زانين و ئاگاداركردنه‌وه‌ی مێرووله‌كانی ديكه‌.

﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ﴾، چونكه‌ هه‌ر نيعمه‌تێك به‌سه‌ر ئه‌ودا بڕژێت بۆ دايك‌و باوكيشی هه‌ر نيعمه‌ته‌، يه‌كێك له‌ نيعمه‌ته‌كانيش بۆيان تێگه‌يشتنيانه‌ له‌ زمانی باڵنده‌ و زينده‌وه‌ران.[2]

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل باب كان رسول الله أحسن خلقا رقم ٤٣٩١.

[2] زبدة التفسير للأشقر، ل٤٩٦.

# بەشی شەشەم
# گاڵتەو گەپ لە فەرهەنگی دەروونی مرۆییدا

ژیان کاروانێکی سەختە زۆر خۆشی و پشووی تێدایە، هەندێکیش ناخۆشی تێدا هەیە، کەسیش لەو ناخۆشیانە قوتاری نابێت کە خۆشیەکانی لا تاڵ دەکات، بۆیە خەڵك پێویستی بە وێستگەو شوێنانێکە تا پشوویەکیان تێدا بدات، هەندێك لەو قورساییانەی کاروانی ژیانیان لەسەر سووك بکات، تا خەمو خەفەت بەسەریاندا زاڵ نەبێت و ژیانیان لێ تاڵ نەکەن و خۆشییەکانیان لەبیر نەبەنەوە، بەشێکیش لەو شوێن و وێستگانە گاڵتەو گەپە و هەرشتێکیشە خەفەت لە دەڵ دەربکات و گرژی دەموچاو بڕەوێنێتەوە خەمۆکی لە ژیان وەدەردەنێت.

## ئەوەی سپاییەك لە چاویدایە

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ئافرەتێك کە بە ئوم ئەیمەن ناودەبرا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وتی: مێردەکەم بانگهێشتت دەکات، فەرمووی: کامەیە؟ ئەوەی سپاییەك لە چاویدایە؟ وتی: نە بە خوا هیچ سپایەتییەك لە چاویدا نییە، فەرمووی: با، سپاییەك لە چاویدایە، وتی: نە بە خوا، فەرمووی: هەموو کەسێك سپیاییەك هەر لە چاویایەتی.[1]

## خوێندنەوەی دەقەکە

ئەم ژنە هاتووە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بکات بۆ سەر خوانێك بانگهێشتی بکات کە بۆی دروستکردووە، بەناوی مێردەکەیەوە بانگهێشتەکە دەکات، تا دەریبخات خانەخوێ رەزامەندە بەم بانگهێشتەی سەروەرمان (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) پرسیاری ناوی مێردەکەی لێ دەکات، بەڵام مەبەستێکی هەیە بۆیە پێش وەڵامی ئەو دەفەرموێت: ئەوەی سپیاییەك لە چاویدایە، ژنە ئەم قسانە کە دەژنەوێت و بە روخساری پێغەمبەریشدا گەمەوگاڵتەیەك نابینێت، واهات بە خەیاڵیدا سپیایی چاو نەخۆشیینە و لە چاوی ساغ دەدات، بۆیە وەڵامی دەداتەوە: (بەخوا سپیایی نییە بە چاویەوە)، خۆ ئەو تازە لای مێردەکەیەوە هاتووە، کەچی پێغەمبەری خوا بەشێوەیەك جەخت لە قسەکەی دەکاتەوە، سەری لێشێواند، بەڵێ، سپیایەتیی بە چاوییەوەیە، سەرسامییەکەی زیادی کردو لای خۆیەوە دەڵێت پێدەچێت مێردەکەمی

---

[1] راوه ابن أبي دنيا، وقال الحافظ العراقي في تخريج الأحياء، أخرجه الزبير بن بكار في كتاب الفكاهة ورواه ابن الدنيا.

نەناسیبێت، بۆیە وەڵامی جاری دووهەمی لاوازترە لەوەی پێشووی وەك بڵێی خەریکە گومانی لا دروست دەبێت، تەنها دەڵێت: نە بەخوا، کاتێکیش سەرسوڕمانەکەی زۆر زیادی کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: هەموو کەس سپیایەتی بە چاوییەوە هەیە. ئەم گاڵتەو گەپەش لای ژنەکە دەبێتە ئەوپەڕی خۆشی لە دوای سەرسامبوونەکەی.

## هونەری شەشەمی سەرکردەی سەرکەوتوو:

## گاڵتەوگە پێکی کەمو خۆش، پایەی دەروونی ئەم نهێنیەی سەرکردە

گاڵتەوگەپ رەفتارێکی کۆمەڵایەتییە، مرۆڤەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، بە پێچەوانەی گیاندارەکانی دیکەوە، ئەمەش میهرەبانیەکەی خوداییە بۆ مرۆڤ تا بتوانێت رووبەڕووی ناڕەحەتییەکانی کاروباری ژیان ببێتەوە، ﴿وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى﴾ (النجم: ٤٣) ئیسلام ئاینێکی مەزنە، ئەم پێویستیانەی خەڵك (گەمەو گاڵتە، پێکەنین، رووخۆشی)، زەوت ناکات، بەڵکو هەر شتێك ژیان خۆش و پاراو بکات ئەم پێشوازی لێ دەکات، پێی خۆشە کەسێتی موسڵمان هیوابەخش و گەشبین بێت، کەسێتی خەمۆك و رەشبینی ناوێت، کە بە چاویلکەیەکی لێڵەوە سەیری ژیان و خەڵکی بکات.

زیادەڕەوی لە توندوتۆڵیدا لەگەڵ سروشتی ئاسایی مرۆڤدا ناسازێت، پەرستشی خودایی و جێنشینایەتی سەرزەوی، ناخوازێ مرۆڤ هەمیشە رەنجدەر و زەحمەتکێش بێت.

# مرۆڤ و ئامێر

رەنجی بەردەوام و نەوەستان ئیشی ئامێرە ـ ئەویش پێی ناکرێت ـ کە بێگیانە، بەڵام مرۆڤ دروستکراوێکی ناسكو هەستیار و بەسۆزە، ئەم هەستو سۆزە دەیبزوێنێت و تینی دەداتێ، ژیان لە نێوان نیمچە توندی و گەمەو گاڵتە، پشوو و ئیشکردن، جوڵە و نشین، واتە لەو نێوەندانەدا دێت و دەچێت لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە، لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی دەوربەریدا کارلێك دەکات، لەگەڵ جموجوڵی بوونەوەردا دەجوڵێت.

بزاوتنی گەردوونیش بزاوتێکی جیاوازە و لەسەر یەك حاڵەت ڕاناوەستێت، بۆیە پێویستە مرۆڤیش لە دەروونیدا لەوە تێبگات و پێویستییەکانی ئەمانە ڕەچاو بکات.

لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: دڵەکان پشوو پێ بدەن، بەشێك لە حیکمەت و قسەی خۆشی بۆ پەیدا بکەن، چونکە ئەویش وەك جەستە شەکەت دەبێت.[1]

﴿طه * مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى﴾ (طه : ١ـ ٢).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باش لەم مانایە گەیشتبوو، چونکە لەگەڵ ئەو گشت سەرقاڵی و کێشە و ئەرکە سەختەی کە لەسەر شانی بوو، کە هەموو ژیانی بۆ جێبەجێکردنی بەسەربرد، کەچی لەو ڕەنجدانە زۆرەدا کەمێك گاڵتەوگەپی تێکەڵ دەکرد و سوعبەتی دەکرد، بەڵام تەنها

---

[1] سەیری الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع، رقم ١٤٠٠.

راستی دەوت، ئەبوهورەیرە دەڵێت: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆش گەمە و گاڵتەمان لەگەڵ دەکەیت، فەرمووی: من تەنها راستەقینە دەڵێم.[1]

ئەو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بە ژیانێکی سروشتی خۆش دەژیا، لە پێکەنین و یاری و گاڵتەوگەپدا هاوبەشیدەکردن وەك چۆن بەشداری خەمو ئازاریان دەبوو.

## ژیان کاروانێکە

ژیان کاروانێکی سەختە، پڕ لە خۆشی و شادی، بێ ئازار و دەردیش نییە، کە ئەو خۆشیو شادییەی لێ تێك بدا، بۆیە مرۆڤ پێویستی بەو وێستگە و شوێنە پشوو هەیە، تا کەمێك لەو شەکەتی و ماندووبوونەی کاروانی ژیانەی لەسەر سووك بکات، بۆ ئەوەی خەمو خەفەت خۆیان زاڵ نەکەن و خۆشییەکانی ژیان تێکنەدەن و گەشییەکانی سیس نەکەن، گەمەو گاڵتەو گەپیش بەشێکن لەو وێستگانە، هەر شتێکی دیکەش کە لابەری خەمی دڵ و گرژی روخسار و خەمۆکی ژیان بێت.

راستییەکەی ئەمەش هونەرێکە لە هونەرەکانی ژیان و کارامەیی سەرکردەی کاریگەر دەردەخات، ئەویش وەختێك سەرکردە، زانا، باوكو دایك، بانگخواز، مامۆستا، پەروەرێن دەتوانێت هاوسەنگییەك دروست بکات لە نێوان ئەرکە سەرەکییەکەی و پەیامە ئامانجدارەکەی و لەنێوان پشووپێدانێکی سووك و سوعبەتکردنێکی کەمدا.

---

[1] اخرجه الترمذي في كتاب الذبائح، باب ما جاء في المزاح رقم ١٩٨٢ وقال حديث حسن.

جا لە ژیانی سەرکردەی مەزنماندا (ﷺ) کە ئەرکی قورسی لەسەر شان بوو، هەندێك نوکتەو قسەی خۆش دەبینین، کە دەبنە هۆی زەردەخەنەیەکی بێگەرد و پێکەنینێکی خۆڕسکانە و خۆشی وشادییەك کە سنووری ئەدەب نابەزێنێت و ڕەزینی و نتمی دەپارێزێت، هەزاران سڵاو لەسەرت ئەی پێشەوا ناوازەکە.

## لەگەڵ یاراندا

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: کابرایەك داوای سواریەکی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، فەرمووی: باشە سواری بەچکە حوشترێکت دەکەم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جا من چی لە بەچکە حوشتر بکەم؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی حوشتر هەمووی بەچکە نەبوون.[1]

## دوو گوێکە

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی دەفەرموو: ها خاوەنی دوو گوێ.[2] بەم بانگکردنی (ها خاوەنی دوو گوێ) پێغەمبەر (ﷺ) گاڵتەو سوعبەتی لەگەڵ ئەنەس دەکرد، خۆ هەموو کەسێك هەر دوو گوێی هەیە، بەڵام بانگکردنی لەم شێوە سەرنجڕاکێشە، ئەوی دەیبیستێت خەیاڵی ئەوە دەکات وێنەی خۆی لە ئاوێنەدا تەماشا بکات و گوێیەکانی ببینێت، کە خۆیشی بە هەردوو گوێچکەکانیەوە دەبینێت

[1] أخرجه الترمذي في سننه في باب ما جاء في المزاح، رقم ٩٨٣ صحيح غريب.

[2] أخرجه ابوداود في سنن رقم ٥٠٠ والترمذي في سننه رقم ٣٨٢٨ حسن غريب صحيح.

پێکەنینی بە خۆی دێت، چونکە هەرکەس لەسەر دوو پیَ بڕوات دوو گوێیشی هەیە، جا لە بانگکەرەکەی تێدەگات، کە مەبەستی گاڵتەو شۆخی بووە، بۆیە بە دەستی خۆی نییە زەردەخەنە دەیگرێت و پێدەکەنێت.

## کیَ ئەم بەندەیە دەکڕێت؟

ئەنەس دەڵێت: کابرایەکی دەشتەکی هەبوو ناوی زاهیری کوڕی حوزام یان حەرام بوو، پێغەمبەر (ﷺ) خۆشی دەویست، کابرایەکی گەنەڵە بوو، جارێك پێغەمبەر هات بۆ لای خەریکی کەلوپەل فرۆشتن بوو، لە دواوە باوەشی پێداکرد، کە ئەو نەیدەبینی، دەیوت: بەرمدە ئەوە کێیە؟ لای کردەوە دەزانێت پێغەمبەرە (ﷺ)، کە زانی ئەوە ئیتر پشتی نووسان بە سنگی پێغەمبەرەوە، پێغەمبەریش دەیفەرموو: کیَ ئەم بەندەیە دەکڕێت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە خوا زۆر سووكو لاوازم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نا لای خوا سووك نیت، یان فەرمووی: نا تۆ لای خودا قورسو سەنگینی.

## دەموچاوە سواغدراوەکان

عائیشە دەڵێت: ڕۆژێك سەودە سەردانی کردین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە نێوان من و ئەودا دانیشتو لاقێکی لە کۆشی ئەو و لاقێکی دیکەی لە کۆشی مندا بوو، منیش شلەیەکی (حەریرە)م کرد وتم بە سەودە: بخۆ، نەیخوارد، وتم: یان دەبێت بخۆیت یان دەیسوم بە دەموچاوتدا، هەر نەیخوارد، منیش هەندێکم لە مەنجەڵەکە

دەرکرد و دەموچاویم پێ سواغ دا، پێغەمبەری خوا قاچی لە کۆشی هەڵبڕی ئەویش دەستی کرد بە مەنجەڵەکەدا و دەموچاوی منی سواغ دا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) پێدەکەنی، لەناکاو گوێمان لە عومەر بوو بانگی دەکرد: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەستن دەموچاوتان بشۆن، وا دەزانم عومەر بۆ ئێرە دێت.[1]

## هاوەڵە گاڵتەبازەکە

نوعەیمانی کوڕی عەمری ئەنساری لەو هاوەڵانەیە کە بەناوبانگە لە گەمەو گاڵتەکردندا، کە نوکتەی خۆشو سەیری لێ دەگێڕنەوە، دەشگێڕنەوە بەشداری پەیمانی عەقەبە و شەڕەکانی بەدر و ئوحود و خەندەقو غەزاکانی دیکەشی کردووە.

## بەندە ئازادەکە

ئوموسەلەمە دەڵێت: بەر لە مردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە ساڵێك، ئەبوبەکر بۆ بازرگانی چوو بوو بۆ بوصرا، نوعەیمانی کوڕی عەمری ئەنساری و سوەیتی کوڕی حەرمەلەشی لەگەڵ بوو، کە هەردووکیان جەنگی بەدریان دیبوو، خواردن لای نوعەیمان بوو، سوەیتیش کابرایەکی سوعبەتچیبوو، وتی بە نوعەیمان: خواردنم بدەیە، وتی: ناتدەمێ تا ئەبوبەکر دێتەوە، وتی: چارت دەکەم، دەڵێت: دایان بەلای

[1] أخرجه النسائي في سنن الكبرى في كتاب عشرة النساء باب الغيرة رقم ٨٦٤٢ اسناده حسن.

خەڵکێکدا، سوەیت چوو بووە لایان پێی وتبوون: بەندەیەکم هەیە لێمدەکڕن؟ وتبوویان: بەڵێ، وتی: ئاخر ئەو بەندەیە هەندێك قسە دەکات و پێتان دەڵێت من بەندە نیم و ئازادم، جا ئەگەر ئەم قسەیەی کرد و ئێوەش باوەڕی پێ دەکەن هەر لە ئێستاوە مەیکڕن و بەندەکەم تێك مەدەن، وتیان: نەخێر لێت دەکڕین، بە دە جوانوە حوشتر لێیان کڕی، پاشان هاتن‌و پەتیان خستە ملی، نوعەیمان هاواری کرد: ئەمە گاڵتەتان پێدەکات، من ئازادم بەندە نیم، وتیان: ئەم قسانەی تۆی بۆ کردوین، ئیتر بردیان، جا کە ئەبوبەکر هاتەوە و هەواڵەکەیان پێدا، رۆشت شوێنیان کەوت‌و جوانوەکانی بۆ گەڕاندنەوە و نوعەیمانی هێنایەوە. کە هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و هاوەڵانیش لە دەوری بوون.[1]

## پیرەژنەکانی بەهەشت

پیرەژنێك چووە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بپاڕێرەوە لە خودا کە بمخاتە بەهەشتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی وت: دایکی فلانەکەس بەهەشت پیرەژنی تێناچێت، ئەویش پشتی هەڵکرد و رۆیشت و کەوتە گریان، فەرمووی: پێی بڵێن ئەو بەپیری تێیناچێت، خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاء (٣٥) فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَاراً (٣٦) عُرُباً أَتْرَاباً (٣٧)﴾ (الواقعة: ٣٥- ٣٧).

---

[1] أخرجه ابن ماجة في سننه في كتاب الأدب، باب المزاح رقم ٣٧٣٥ وقد ضعفه الألباني.

## قسەی کۆتایی

ئەگەرچی هەندێك لە حەکیم و عاقڵەکان زەمی گاڵتەوگەپیان کردووە، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە پێغەمبەری سەرکردە و هاوەڵانی کردویانە، هەرئەویشە کە دەبێت چاوی لێ بکرێت، چونکە پێکەنین و گەمەو گاڵتەو گەپ رێگەپێدراون، باشترین بەڵگە گوفتار و رەفتاری پێغەمبەری سەرکردەیە (ﷺ). ئەو سەرکردە بە قسە و کردەوە خۆشەویستان هاندەدات کە دەمبەخەندە و رووکراوە و دڵگەش بن، سیفەتی شیرین و کردەوەی جوان ئەنجام بدەن، مەجلیس ئارا بن، کەواتە وا باشە توندوتۆڵی زاڵ بێت و کەمێکیش گەمەو گاڵتە و قسەی خۆش و نوکتەی ئاوێتە بکرێت.

## خوێی چێشت

با گاڵتەو گەپ وەك خوێ بێت، با پەروەرێن، مامۆستا، زانا، بانگخواز، ئەوەندەی خوێی چێشت گاڵتەو گەپ بکاتە قسەکانیەوە، ئەندازەی خوێ ئەندازەیەکی وردە، چونکە ئەگەر کەمبوو بێ تام دەردەچێت، ئەگەر زۆریش بوو سوێر دەبێت.

## گەوهەری موحەممەدی

لە سەردەمی پێشینی پێغەمبەر خوا و هاوەڵانیدا، کاتەکە سەردەمی توندوتۆڵی و سەردەمی جیهاد و ئارامگری بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی خاوەن دەروونێکی کراوە و گیانێکی شادی بەخش بوون، بە گەمە و گاڵتەیەکی خۆشەویستی کۆتایی دەهات، بەراستی ژیانێکی خۆش بەختەوەرانە بوو.

## گەوهەری شەشەم

ئوسەیدی کوڕی حوزەیر لە پیاوێکی ئەنسارییەوە دەگێڕێتەوە کە قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد، قسەکانی گاڵتەبازییەکی تێدا بوو، خەڵکەکەی پێدەکەناند، پێغەمبەر (ﷺ) تولێکی کێشا بە کەلەکەیدا، وتی: هەقەکەم بدەوە،فەرمووی: هەقی خۆت بکەرەوە، وتی: تۆ کراست لەبەردایە و من لەبەرمدا نەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) کراسەکەی هەڵکرد ئەویش باوەشی پێدا کرد و دەستیکرد بە ماچکردنی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئەمەم دەویست.[1]

## شەشەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو:
## گاڵتەیەکی کەم و گە پێکی سووکە

کەواتە لە جێی خۆیدایە گاڵتەو گەپێکی خۆش بکە، ئەو سیفەتەت ستایش دەکرێت و بەخۆش مەشرەب دەناسرێیت.

﴿يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ﴾ (البقرة : ٢٦٩).

حیکمەت زانستە، وتراویشە: تێگەیشتنە لە کاروبار.

دەشوترێت: قسە پێکانە.[2]

---

[1] اخرجه ابو داود في سننه في كتاب الأدب، رقم ٤٦٠٥ وصححه الألباني وأخرج الحاكم نحوه في المستدرك رقم ٥٣٤٢ صحيح الإسناد.

[2] زبدة التفسير للأشقر، ل٥٧.

# بەشی حەوتەم
# ئافرەتی راسالْ لە فەرهەنگی سەرکردەی سەرکەوتوودا

خۆشەویستی بۆتەقەی ژیان و هەوێنی گیانە، سۆزێکە لە هەموو دروستکراوێکدا هەیە و ئاوێتەی هەموو زیندەوەرێکە، خۆئەگەر پێکەنین و گریان لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ بن، ئەوا خۆشەویستی هەموو ژیان و سەرجەم زیندەوەران دەگرێتەوە، بە گشت ئاوەدانیەکدا پرش‌و بڵاوە و لە هەموو دڵێکدا جێنشینە، بە جیاوازی رەگەز و رەنگیانەوە.

## دڵێکی لەرزیو

ئەم ئایەتە مەزنە (اقرأ) دابەزیە سەر گۆشەگیرە تەنهاکەی ئەشکەوت، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە و دڵی دەلەرزی، تا گەشتەوە خەدیجە و فەرمووی: دامپۆشن، دامپۆشن، دایانپۆشی تا سامو بیمەکەی نیشتەوە، ئەوسا بە خەدیجەی فەرموو: خەدیجە ئەوە چیمە، راستییەکەی لە خۆم دەترسم، ئیتر هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە.

خەدیجە وتی: نەخێر، مژدە بێت، سوێند بەخوا هەرگیز خودا تۆ سەرشۆڕ ناکات، سوێند بە خوا تۆ خزمایەتی بەڕێوە دەبەیت، لە قسەکردندا راستگۆیت، دەستبار بۆ خاوەن پێویستی دەگریت، هاوکاری نەدار دەکەیت، رێزی میوان دەگریت، یارمەتی کارەستباران دەدەیت.[1]

## خوێندنەوەی دەقەکە

خەدیجە، خوێنەری خۆشەویست ئەم ناوە هیچ شتێکت بیر دەخاتەوە؟ ئایا بیری هەڵوێستێکی مەزنت ناخاتەوە لەسەرەتای دابەزینی نوور و رژانی رەحمەتی خوایی، کاتێك جوبرەئیل ئەو رووناکییە پرشنگدارەی هێنا، دەمارەکانی حەزرەت راچڵەکێن، خوێنی وەرگرتن رژایە دڵی و سروەی نیگا سنگی لە شیرك و نەفامی سڕیەوە، بەڵام لەبەر خۆشحاڵبوونی لەڕادەبەدەری و قورسی ئەو ئەرکەی پێی سپێررا بوو، پاڵەپەستۆیەك لە نێوان دڵشاد بوون بە نیگا و خەمی

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن، ٤٦٨٥.

پەیامەکە پەیدا بوو لە نێوان فێنکی نیگا و گەرمی ئەرکەکەدا دڵی لەرزی.

بەڵام جارێ ئارامبە... ئێستە لێرەدا تەواو نابێت، خۆئەگەر دڵیش بلەرزێت لە ماڵەوە فێنکیەك هەیە ئەم ساردیە لا دەبات، ئەگەر جەستەش بشڵەژێت لە ماڵەکەدا پەنایەکی بەهێز هەیە ئەم شڵەژانە هێورکاتەوە، ماڵەکە خەدیجەی تیایە.

خەدیجە... پەیژەی سەرکەوتن کە پێغەمبەری بەرەو ژوور برد هەر لە یەکەم پلەی پەیامەکەوە، ئەو پەنایەکی فێنك بوو کە ئامێزی بۆ دڵێکی لەرزیو کردەوە.

## خەدیجە

سەیری ئەم دەربڕینە پاراوە کە سنگی پیاوە داپۆشراوەکەی فێنککردەوە و دڵنیایی پێبەخشی (نەخێر سوێند بە خودا، خودا هەرگیز سەرشۆڕت ناکات، تۆ خزمایەتی بەڕێوە دەبەیت، لە قسەکردندا راستگۆیت، دەستبار دەگریت بۆ خاوەن پێویستی، هاوکاری نەدار دەکەیت، رێزی میوان دەگریت، یارمەتی کارەساتباران دەدەیت).

بەڕاستی ئەو پایە بوو کە پێغەمبەرە نوێیەکە پاڵی پێوە دا، بەڕاستی پەیژەی سەرکەوتن و دڵنیایی بوو بۆ پێغەمبەر لە کاتێکی زۆر سەخت و دژواردا.

## حەوتەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو:

## هاوسەرێکی سەلارە پایەی دەروونی ئەم هونەرەی سەرکردایەتیە

ماڵ ئەو مێرگو نشینگەیە کە مێرد لە دوای شەکەتیەوە، پەنای بۆ دەبات و ئەو سایەیە ماندوێتی تێدا دەحەسێتەوە، خێزانی راساڵیش ئەو سووکناییەیە کە مێرد پەنای بۆ دەبات. تاریکە رێگاکان مرۆڤ ماندوو دەکەن و زەحمەتکێشان جەزرەبەیان تێدا دەچێژن، بەڵام لە ماڵەوە خۆشەویستی و ئاسوودەیی و بەختەوەری جێگایان پڕ دەکاتەوە. لە شارستانیەتی میللەتان و پەندی گەلاندا دەوترێت (لە پشتی هەموو پیاوێکی مەزنەوە ئافرەتێکی مەزن هەیە)، پیاو چۆن مەزن دەردەچێت کە گەڕایەوە ماڵەوە ئاژاوە و گرفت بەرەو رووی بووەوە. چ ماندوودەرچوونێك دەبێت لە رەنجی فەرهادیەوە بڕواتەوە بۆ لای روخساری گرژ و مۆن.

کەواتە کەی بحەسێتەوە و پشوو بدات!!

## پیاوی رۆژهەڵاتی

پیاوانی کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی لە وێناکردنێکی هاوسەنگیی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتی و بنەمای مامەڵەکردنیان لەگەڵ خێزانیاندا جیاوازن. پەندی پێشینان رەنگدانەوەی کەلتووری گەلان و بیروبۆچوونی کۆمەڵگەکانە، بەم پێودانگە پیاوان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا جیاواز وەسفی پەیوەندی هاوسەریانکردووە و جیاواز باسیان لە مامەڵەکردن لەگەڵ ژندا کردووە. پەندی پێشینانی وا هەیە دەڵێت: (دڵی راگرە، لەناخیدا ئارام دەگریت)، هەشیانە دەڵێت: (ژن وەك قاڵی عەجەمە تا زیاتر پێی پیانێیت رەونەقدارتر دەبێت)، لەنێوان ئەم دوو پەندەشدا چەندین بیروبۆچوون و رای جیاوازی دیکە هەن.

## هاوسەری سەرکردە

هاوسەری سەرکردەی ڕێنماییکار (ﷺ) سێ شتی لە ئامێزگرتووە.

سوکنایی.... بۆ دڵو دەروون و جەستەش.

خۆشەویستی... کە لێیەوە گیانی سەرنشین دەفرێت.

سۆز... کە سەختی گوزەران و ناڕەحەتی ژیان سانا دەکاتەوە.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الروم : ٢١).

## پێنج بنەما بۆ دروستکردنی هاوسەرێکی مەزن

بە خوێندنەوەی ژیاننامەی (ﷺ) و ئەو شوێنانەی تێکەڵی خێزانی تێدایە لە ژیانیدا، ئەوانەی لێکنزیکن کردومن بە چەپکێك و ناومناوە بنەماکانی دروستکردنی هاوسەرێکی مەزن، وەکو بۆشم دەرکەوتووە پێنج بنەمان:

بنەمای یەکەم: خۆشەویستییەکی پرژاو، خۆشەویستی ئیکسیری ژیان و هەوێنی گیانە، سۆزێکە هەموو بوونەوەرێك هەیەتی ئاوێتەی هەموو زیندەوەرێکە، خۆ ئەگەر پێکەنین و گریان لە تایبەتییەکانی مرۆڤ بن، ئەوا خۆشەویستی هەموو ژیان و سەرجەم زیندەوەران دەگرێتەوە، بە گشت ئاوەدانییەکدا پرشو بڵاوە و لە هەموو دڵێکدا جێنشینە بە جیاوازی ڕەنگو ڕەگەزیانەوە.

## ماڵو خۆشەویستی

ماڵی بێ خۆشەویستی کاروبارێکیشی پێدا تێپەڕێت بیابانە، ئەو ماڵانەش خەڵکەکەیان خۆشەویستیان نەنۆشیوە وشكو برنگن، با دەنگیشیان بڵندکەن، ئەو دڵانەی لە خۆشەویستی خاڵین تۆز و بان هەرچەندە هەناسەش بدەن، بۆیە یەکەم شت لە ژیانی هاوسەرێتی مامۆستای پیشاندەر (ﷺ) سەرنجڕادەکێشێت خۆشەویستییەکی زۆرە، بەجۆرێك ماڵەکەی ببوە مێرگی خۆشەویستی و گوڵستانی ئولفەت.

## نیشانە دیارەکانی خۆشەویستی

عوروە دەڵێت: موسڵمانان دەیانزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندە عائیشەی خۆش دەوێت، بۆیە ئەگەر یەکێکیان دیاریەکیان هەبوایە و بیویستایە بیدان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای دەخست تا ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵی عائیشە دەبوو، ئەوجا خاوەنی دیاریەکەی دەنارد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ماڵی عائیشە.[1]

## خۆشەویستی ڕۆزیەکی زانراوە

عائیشە دەڵێت: غیرەم بەرامبەر هیچ هاوسەرێکی پێغەمبەر (ﷺ) نەدەکرد جگە لە خەدیجە، من پێشینەگەیشتبووم، دەڵێت: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بزنێکی سەردەبڕی دەیفەرموو: ئەمە ببەن بۆ

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الهبة رقم ٢٤٦٤.

هاوڕێکانی خەدیجە، دەڵێت ڕۆژێك توڕەمکرد کە وتم: خەدیجە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: من ڕۆزی خۆشەویستی ئەوم پێ بەخشراوە (انی قد رزقت حبها).[1]

## شۆربایەکی خۆش و خۆشەویستێکی خۆشتر

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دراوسێیەکی فارسی هەبوو، شۆربای خۆشی لێدەنا، جارێك چێشتێکی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێنا و دوایی هات بانگهێشتی کرد، فەرمووی: ئەی ئەمە (مەبەستی عائیشە بوو) فارسەکە وتی: نا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەمە؟ وتی: نا، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نا، دوایی فارسەکە هاتەوە بانگهێشتی کردەوە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەمە؟ وتی: بەڵێ، لە سێ جاردا، ئەوجا هەردووکیان پێکەوە چوونەماڵەکە.[2]

## گوڵاوی سەرمۆر

ئەوەی لە ژیاننامەی سەرکردەی مەزندا (ﷺ) جێگیر بووە لە ژیانی هاوسەرێتیدا، مافی هەموانی داوە، لاینەکردووەتەوە بۆ مەیلی دڵ (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دابەشکردندا دادگەریی دەکرد و دەیفەرموو: خودایە ئەمە دابەشکردنمە لەوەی دەسەڵاتمە، لێشم مەگرە لەوەی دەسەڵاتی تۆیە و بەدەستی من نییە).[3]

---

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل، باب فضائل خديجة رقم ٤٥٨٧.

[2] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الأشربة، باب ما يفعله الضيف رقم ٣٩١.

[3] أخرجه ابو داود في كتاب النكاح، باب تقسيم بين النساء رقم ١٨٥٦، واخرجه حاكم في المستدرك في كتاب النكاح رقم ٢٧٠٦ وقال: حديث صحيح.

## بنەمای دووهەم:

## هاوبەشیکردن لە کاری ماڵ و خزمەتی دانیشتوانەکەی

کارلێککردنی ناوماڵ چێژێکی تایبەتی هەیە، تۆ ئەگەر ورد سەرنجی پیاو بدەیت لە دەرەوە لەگەڵ خەڵکدا زۆر لە خۆی دەکات جوانترین شتی دەردەخات و شیرینترین قسەو کاری دەردەبڕێت، بەڵام لە ماڵدا، پیاو بە سروشتی هەڵسوکەوت دەکات، خوی راستەقینەی چۆنە بەو شێوە دەجولێتەوە، بۆیە ئەگەر لەسەر هەڵسوکەوتی دەرەوەی ماڵ حوکم لەسەر هەر پیاوێك بدەیت بە ویژدانەوە نابێت، بەڵکو راست ئەوەیە لەسەر هەڵسوکەوتی ماڵەوەی حوکم لەسەر رەفتار و بەهاو ناخی پیاو بدەیت، چونکە ئەو حوکمە لەسەر خووە راستەقینەکەیەتی، بۆیە سەرکردەی مەزنیشمان بەم مانایە فەرموویەتی: (باشترینتان ئەوانەن بۆ خێزانتان باش بن، منیش لە هەمووتان باشترم بۆ خێزانم).[1] ئەمەش چەند وێنەیەك لە گۆشەی ماڵی سەرکردە مەزنەکە و باشترین هاوسەرە بەڕێزەکە (ﷺ) بۆ تۆی خوێنەری بەڕێز:

## مرۆڤێکی تێر و تەواو

لە عائیشەیان پرسی: ئیشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵەوە چی بوو؟ وتی: ئەویش وەك هەرکەسێك وابوو، کراسەکەی خۆی دەدورییەوە، بزنی دەدۆشی، خزمەتی خۆی دەکرد.[2]

---

[1] أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب الحج باب الهدي رقم ٤٢٤٤.

[2] أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب الحظر والإباحة رقم ٥٧٥٩.

له گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێت: (کراسەکەی خۆی دەدوورییەوە، نەعلەکانی پینەدەکرد، ئەوی پیاو لە ماڵی خۆیدا دەیکات ئەویش دەیکرد).[1]

## مێردێکی هاوکار

ئەسوەدی کوڕی یەزید دەڵێت: لە عائیشەم پرسی پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵەوە چی دەکرد؟ وتی: لە خزمەتی خێزانەکانیدا بوو (خدمة أهله)، کاتی نوێژیش دەهات دەچوو بۆ نوێژ.[2] بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم کار و کردەوانە کەلتووری بەڵێ قوربان قوربانی هەڵوەشاندەوە، کە هەندێك خەڵك کەشخەی پێوە دەکەن و بەشێوەیەك لەشێوەکانی پیاوەتی دەزانن، کە سوێند بەخوا هەڵەن.

## بنەمای سێهەم: تێکەڵیەکی شیرین و مێردێکی نەرمونیان

ئەم مامۆستا بەڕێزە (ﷺ) بۆ نەرمو نیانی زۆری لەخۆی نەدەکرد، ئەو لەناو هاوەڵان و لە ماڵەوەش هەر بە نەرمونیان، زەردەخەنەی گەش، گەمەو گاڵتەی ناسك، دەناسرا، ئەمانە بۆ پڕوپاگەندە و خۆنمایشکردن نەبوو، بەڵکو ناخی دەروون و کرۆکی رۆحی هەروابوو، دڵە بێگەردەکەی لەسەری راهاتبوو، ببوە خوویەکی هەمیشەییو سیفەتێکی بەردەوامی، ئەوەی کە فەرمووبووی: (لەسەرخۆ لێخوڕن، لەبەر ناسکەکان)[3] رەفتارێکی زیندووی بوو، هاوسەرەکانی بۆنی گوڵاوەکەیان لە ماڵەوە هەڵدەمژی.

---

[1] أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب الحظر والإباحة رقم ٥٧٦١.

[2] أخرجه البخاري في الصحيح في كتاب الأذان با من كان في حاجة أهله.... رقم ٦٥٥.

[3] أخرجه البخاري في الصحيح في كتاب الأدب باب ما يجوز من الشعر والرجز والحداء وما يكره رقم ٥٨١٥.

## باوەڕداری بەسۆز

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (باوەڕدارترین باوەڕدار رەوشتت جوانترینیان و بەسۆزترینیانە لەگەڵ ماڵو خێزانیدا).[1]

## پیاوێکی ئاسانکار

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: عائیشە تووشی سوڕی مانگانە بوو، لە حەجدا هەموو دروشمەکانی جێبەجێ کرد جگە لە تەوافی کەعبە، کە پاکیش بووەوە تەوافی کەعبەشی ئەنجامدا، جا وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێوە بە حەجو عەمرەیەکەوە دەچنەوە و من تەنها بە حەجێکەوە بێمەوە؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمانیکرد بە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر لەگەڵیدا بچێت بۆ (تەنعیم) لەوێوە عەمرەیەکی دوای حەجەکەی کردەوە.[2]

لە گێڕانەوەکەی موسلیمدا جابر دەڵێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی ئاسان بوو، ئەگەر عائیشە حەزی لە شتێك بکردایە بۆی دەکرد).[3]

---

[1] أخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب الإيمان، رقم ١٥٩.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح ، الحج، رقم ١٥٧٩.

[3] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الحج، رقم ٢٢١١.

## مێردێکی نەرمونیان

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت: عومەر مۆڵەتی چوونەژوورەوەی بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت، لەو کاتەدا کۆمەڵە ژنێکی قوڕەیشی دەیاندواند و داوای زۆرکردنی نەفەقەیان دەکرد، دەنگیان بەسەر دەنگیدا بەرز دەکردەوە، بەڵام کە عومەر مۆڵەتی وەرگرت خۆیان پێچایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی داو عومەر هاتە ژوورەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێدەکەنی، عومەر وتی: خودا هەمیشە دەمت پێبکەنێنێت ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سەرم لەم ژنانەی دەورم سووڕدەمێنێت، کە گوێیان لە دەنگی تۆ بوو چوونە ئەودیو خۆیان پێچایەوە، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ شایستەتری کە سامت لێ بکەن، پاشان عومەر وتی: ئەی دوژمنانی خۆتان لە من سام دەکەن و لە پێغەمبەری خوای ناکەن؟ وتیان: بەڵێ تۆ توند و رەقتری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی کوڕی خەتاب، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، شەیتان لەهەر رێگایەکدا پێت بگات، رێگاکە دەگۆڕێت بۆ رێگایەکی دیکە.[1]

عەینی دەڵێت: ژنانی قوڕەیش، خێزانەکانی پێغەمبەر بوون (ﷺ).

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب رقم ٣٥٠٨.

## بنەمای چوارەم: ئیدارەدانی گیروگرفتەکان

حەکیمان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە گیروگرفت بەشێکی ژیانی خێزانییەو وەك خوێیە بۆ ژیان و ئایینی ئیسلامیش بڕیاری داوە لە قەفەسی زێڕینی خێزانیدا باڵادەستی بۆ پیاو بێت، کەچی ئەم بڕیارە قورئانییە بە هەڵە بەکاردەهێنرێت، بەشێکی پیاوان وا لێیتێگەشتوون کە مافی خۆیانە راوبۆچوونیان بسەپێنن و بەتەنها بڕیار بدەن و لە ماڵدا لەسەرەوەر بن، بەڵام ئەوەی من تێیگەیشتووم ئەم بەرزکردنەوەیەی قەدری پیاو و باڵادەستییەی بۆ ئەوەیە دەستپێشخەری چاکسازی بێتو لە مافی خۆی دابەزێت و خۆگر بێتو چاوپۆشی لە هەڵەو پەڵە بکات، چونکە هۆی باڵادەستییەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە عەقڵی دامەزراوتر و رای پەسەندتری هەیە، فەرموون با لە ژیانی سەرکردە مەزنەکەوە (ﷺ) چەند نموونەیەك وەرگرین.

## غیرەی هاوسەرەکەی

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەلای هاوسەرێکی بوو، یەکێك لە دایکی باوەڕداران قاپێك خواردنی بۆ نارد، **هاوسەرەکەی** کە پێغەمبەری لابوو، دای بە دەستی خزمەتکارەکەدا و قاپەکە کەوت و شکا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارچەکانی کۆکردەوە و خواردنەکەی تێکرد و فەرمووی: دایکتان غیرە دەکات، پاشان خزمەتکارەکی گلدایەوە تا قاپێکی لە ماڵی ئەو هاوسەرەی هێنا کە لێی بوو، جا قاپە ساغەکەی ناردەوە بۆ ئەو خێزانەی قاپەکەی شکا بوو، شکاوەکەی لای ماڵی ئەو خێزانەی شکاندی هەڵگرت.[1]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب النكاح باب الغيرة ٤٩٤٢.

# رازیکردنی تووڕە

نوعمانی کوڕی بەشیر دەڵێت: ئەبوبەکر مۆڵەتی چوونەماڵی پێغەمبەری وەرگرت و گوێی لە دەنگی بەرزی عائیشە بوو، کە چووە ژوورەوە دەستی بەرزکردەوە کە لێیدا و وتی: نەتبینم دەنگ بەسەر پێغەمبەری خوادا بەرز بکەیتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی گرت، ئیتر ئەبوبەکر بە تووڕەیی چووە دەرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەبوبەکر بە تووڕەیی چووە دەرەوە فەرمووی: چۆنت دی لەو پیاوە رزگارمکردی؟ ئیتر ئەبوبەکر چەند رۆژێك نەهاتەوە، دوایی کە هاتەوە و مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت دەبینێت ئاشتن پێی وتن: وەك چۆن لە شەڕەکەتاندا بەشدارتان کردم، دەی لە ئاشتیەکەشدا بەشدارمکەن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوا کردمان، ئەوا کردمان.[1]

عائیشە هەڵە دەکات و پێغەمبەر (ﷺ) دەستپێشخەری ئاشتەوایی دەکات، ئەو دەنگ بەسەر پێغەمبەردا بەرز دەکاتەوە، کەچی پێغەمبەر دەستبەرز ناکاتەوە و بەرگریی لێدەکات و دەیپارێزێت، لەمیشدا هەر دەستپێشخەرە، باوکی ژنەکە ئامادە دەبێتو گوێی لە کچەکەیەتی شتێك دەڵێت کە نەدەبوو بیبیستایە، زۆر پیاو هەیە بۆ هەلێك دەگەڕێت خوا خوای هەڵەیەکیەتی لە هاوسەرەکەی تا سزای بدات، بەڵام ئەم سەرکردە مەزنە (ﷺ) ـ کە باوکی ژنەکەی خۆی شایەت و ئامادەیە ـ جگە لە خۆشەویستی و رەزامەندی دەربڕین، هیچی نەکرد، بەڵکو چووە ریزی هاوسەرەکەیەوە و لە تووڕەیی باوکە شایەتحاڵەکەشی پەنای دا، بەڕاستی باڵادەستی ئاوها دەبێت.

---

[1] اخرجه ابو داود في سننه في كتاب الأدب، رقم ٤٤٠٣.

## بنەمای پێنجەم:

## پێزانین و رێزگرتنی راو بەشداركردنیان لە بڕیاروەرگرتندا

ئەو بنەمایەی كە هێرشی فیكری دژی ئیسلامی لەسەر بنیاتنراوە گوایە دژی مافی ئافرەتە، ئەوەیە كە ئیسلام كەسایەتی سەربەخۆ نادات بە ئافرەت و راوبۆچوونی سووك سەیر دەكات و قەدری ناگرێت، لەم هەڵوێستانەدا كە سەرقافڵەی كاروانی ئیسلامی (ﷺ)و مەردەكانی دەوروبەری تۆماریانكردووە، هەڵوەشاندنەوەی ئەو بوختانانەیە و سڕینەوەی ئەو درۆیانەیە و روونكردنەوەی هەموو ئەو گومانانەشە كە دەیانوروژێنن.

### فەرمانی پێ كردن سەربتاشن و قوربانی بكەن رازی نەدەبوون

عومەر سەبارەت بە ئاشتەوایی حودەیبیە دەڵێت: كاتێك لە مەسەلەی نووسینەكە لێبوەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵانی: هەستن قوربانی بكەن و دواییش سەربتاشن، دەڵێت: سوێند بە خوا یەك پیاو هەڵنەستا، تا سێ جاریش دووبارەی كردەوە، كەسیان هەڵنەستان، چووە ژوورەوە بۆ لای ئوم سەلەمە، ئەوەی بۆ باسكرد بەدەست خەڵكەكەوە حاڵی چۆنە، ئوم سەلەمەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەكەیت وا بكەن؟ هەستەو یەك قسەش لەگەڵ كەسیان مەكە، خۆت قوربانی بە حوشترەكەت بكەو بانگی سەرتاش بكە سەرت بتاشێت. ئەویش هاتە دەر لەگەڵ كەسیان قسەی نەكرد تا ئەوەی كرد، حوشترەكەی كردە قوربانی و بانگی سەرتاشی كرد سەری تاشی، كە هاوەڵانی ئەوەیان بینی هەستان و قوربانییان كرد، كەوتنە سەرتاشینی یەكتر، تا خەریكبوو لە خەفەتا یەكتر بكوژن.[1]

---

[1] انظر القصة بطولها في الجامع الصحيح للبخاري في كتاب الشروط باب شروط في الجهاد و... رقم ٢٦٠٣.

## رایەکی دیکە

عومەر دەڵێت: سوێند بە خوا ئێمە لە نەفامیدا حسابمان بۆ ژن نەدەکرد، تا خوای گەورە ئەوەی دابەزاند کە دایبەزاند، ئەو بەشەشی پێدان کە پێیدان، تا جارێك خەریکی کاروبارێك بووم، ژنەکەم پێی وتم : ئەگەر ئاوها و ئاوها بکەیت! منیش پێموت: تۆ چ پەیوەندییەکت بەوەوە هەیە! تۆ چیتە بەسەر کارێکەوەیە من دەمەوێت بیکەم، ئەویش وتی: کوڕی خەتاب تۆش سەیریت، ناتەوێت قسە لە قسەتا بکرێت، کەچی کچەکەت ئەوەندە قسە لە قسەی پێغەمبەری خوادا دەکات تا ئەوەی جاری وا هەیە هەموو رۆژەکە تووڕەیە.

## گەوهەری محەمەدی

خوێنەری بەڕێز: ئەگەر بابەتێکت پێ زۆرە و نازانیت لەم گشت گوڵانە کام چەپك بچنیتەوە و بۆنیان بکەیت، دەی لە جوانی هاوەڵێتی و خۆش مەشرەبیدا تەنها ئەم گەوهەرەت بەسە.

## گەوهەری حەوتەم

سەلیقە و خۆش مەشرەبی پێغەمبەر گەشتبووە ئاستێك هەندێك کەس بە ئەستەمی دەزانن. ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: چووین بۆ جەنگی خەیبەر، کاتێك پەروەردگار قەڵاکەی بۆ کردینەوە باسی جوانی سەفیەی کچی حەیی کوڕی ئەختەبی بۆ کرا، کە هێشتا بووك بووە و مێردەکەی کوژراوە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ خۆی هەڵبژارد،

هێنای تا گەیشتینە (سد الصهباء) لەوێ کۆچمان داناو پێغەمبەری خوا گواستیەوە، جا چێشتێکی لە مەنجەڵێکی بچووکدا کرد، پاشان فەرمووی: بانگی ئەو خەڵکەی دەوروبەرت بکە، ئیتر ئەوەبوو بە دەعوەتی زەماوەنەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ سەفیە، پاشان هاتینەوە مەدینە، بینیم پێغەمبەری خوا پارچە قوماشێکی دا بە دەوری پشتی حوشترەکەیدا، پاشان چووە سواری حوشترەکە و ئەژنۆی دانا و سەفیە قاچی خستە سەر ئەژنۆی تا ئەویش سوار بوو.[1]

جا توخوا پێمبڵێ ئەمڕۆ چ پیاوێك دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی یان دەرگای خانووەکە دەکاتەوە بۆ خێزانەکەی، کە هەمیشە لەخزمەتیایە و هەموو گەنجێتی بۆ حەوانەوەی ئەو بەسەربردووە.

## حەوتەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو: ژنە هاوسەرێکی مەزنە

دەی خۆشەویستی بپرژێنە بەناو ماڵەکەدا، هاوسەرەکەت بەشدار بکە لە ڕادەربڕیندا، لە هەڵەکانی خۆش بە، لە کاتی دەسەڵاتدا نەرمو نیان بە، ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (النساء : ١٩)، واتە: ئەوەی لەم شەریعەتەدا باشە و لەناو کەس‌وکاریشدا لە هەڵسوکەوتی جوان لەوانە خودا ڕێگەی پێداون ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة : ٢٢٨)، پیاو جوان لەگەڵ ژندا رەفتار بکات و ژنیش جوان لەگەڵ پیاو رەفتار بکات.[2]

---

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الجهاد والسير باب من غزا ... رقم ٢٧٦١.

[2] زبدة التفسير للأشقر.

# بەشی هەشتەم
# منداڵی سەرکەوتوو لە فەرهەنگی خێزانێکی سەرکەوتوودا

موسڵمان لە ئەمڕۆدا پێویستیان بە بەخۆداچوونەوەیەکی گشتگیر هەیە، لە پەروەردەی منداڵ و بایەخدانیان بە تازەپێگەیشتووان، پێغەمبەری خوا بە وتە و کردار بنەمای بۆ هەموو رەفتارێکی پەسەند و رێڕەوێکی پەروەردەی نەوجەوانان داڕشتووە، کەچی هەندێك لە پەروەرشکارانی خۆمان دەچن لە جۆن و ئیدوارد و جیمس و سمیسەوە پەروەردە وەردەگرن، ئەوانە هێشتا ژیانی پەروەرشکاری یەکەمیان (ﷺ) نەخوێندووەتەوە و لەسەر شێوازی پەروەردەیی ئەو نەوەستاون و سەرنجی رێچکەکەی ئەویان نەداوە.

## تەمەندرێژ بیت و بیدڕێنیت

دایکی خالیدی کچی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس دەڵێت: لەگەڵ باوکم چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کراسێکی زەردم لەبەردابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: جوانە، جوانە، دەڵێت: دەستمکرد بە یاریکردن بە مۆری پێغەمبەرایەتییەکە (کە بە پشتی پێغەمبەرەوە بوو)، باوکم رێگەی لێگرتم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: وازی لێبهێنە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تەمەندرێژبیت و بیدڕێنیت، پاشان تەمەندرێژ بیت و بیدڕێنیت، پاشان تەمەندرێژ بیت و بیدڕێنیت، عەبدوڵلا دەڵێت: ئەوەندە تەمەنی درێژبوو تا بووە جێگەی باسکردن.[1]

## خوێندنەوەی دەقەکە

وەرن با سەرنجی ئەم هەڵوێستە بدەین و ئەم چیرۆکە بخوێنینەوە و لە دێڕەکانی ورد ببینەوە، ئەوانە هاتوون بۆ لای پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ)، لە سەرەتاوە دەزانن قبوڵیەتی منداڵیش سەردانی بکات و لە مەجلیسیدا بجوڵێت، ئەمەیان لە مەزنترین پەرستشدا کە نوێژە و لە پیرۆزترین جێگەدا کە مزگەوتە لێ بینیوە، ئەوان چەندین جار حەسەن و حسەینیان دیبوو لە مزگەوتەکەیدا هاتوچۆیان دەکرد و لە میحرابەکەیدا یارییان دەکرد و لە کاتی سووژدەبردندا سواری پشتی دەبوون.

[1] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح كتاب الأدب باب من ترك حبية عيرة حتى تلعب، رقم ٥٦٦.

چەندین جار بیستبوویان لەو سەرکردە مەزنە (ﷺ) کە لەگەڵ بچووکەکاندا بەسۆز بن و خۆشەویستییان بۆ دەربڕن و دەستخۆشیی لە ئیشیان بکەن. چەند جار ئەم سەرکردە گەورەیان (ﷺ) دیبوو نوێژەکانی کورت دەکردەوە، لەبەر پەلاماری دوژمن و هاتنی دۆستان نا، بەڵکو لەبەر ئەوە کورتی دەکردەوە کە گوێی لە گریەی منداڵێکە لە ریزەکانی دواوە. بەڵێ کەواتە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگەشاوە بە منداڵان و بێگەردیەکەیانی وەردەگرت، لەگەڵ ئەوەی گەمەی منداڵانە و یاری زارۆکانەشیان دەکرد.

## دایکی خالیدی کچی خالید

ئەم کچۆڵەیە لەگەڵ باوکیدا بەبێ ناڕەزایی دەربڕینی کەس چووە مەجلیسی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، کاتێکیش سەرکردەی پەروەرێن (ﷺ) دیتی و سەیری رازاوەیی و جوانی کراسەکەی کرد، پیایدا هەڵدا و ستایشی کرد، ئەو کچۆڵەیەکی بچووکی کەم تەمەنە، رۆح پاكو دڵودەروون خاوێن بوو، ئەویش وەك هەر کەسێکی تر خاوەنی حەز و ئارەزوو و ئاواتە.

## سەرقاڵبوون بە گەورەکانەوە

قسەکردن لەگەڵ گەورەدا (باوکی)، پێغەمبەری خوای سەرقاڵ نەکرد لەوەی سەرنجی ئەو منداڵە و کراسەکەی و رەنگە جوانەکەی بدات.

لەو وەختەدا رازاوەیی گرنگبوو، چونکە موسڵمانان ماوەیەك تەنها پێویستییە بنەڕەتییەکانیان پێ فەراهەم دەهات، ئەو سەردەمەی لە

مەدینە ئابلۆقە درابوون، پێش ئەوەش لە مەککە لە ناڕەحەتیدا بوون، ئەو حاڵەتەش وایکردبوو بیر لە کاڵاو خۆراکی گرانبەها نەکەنەوە.

بەڵام بەو گشت ناڕەحەتییەشەوە منداڵ هەر منداڵە، حەزی لە جوانییە و خۆڕازاندنەوەی پێ خۆشە، ئەی ئەمانە بۆ ئەوان نەبێت بۆچی دروستکراون. ﴿أَوَمَن يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ﴾ (الزخرف : ١٨).

کەواتە ئەمە سروشتی خودایی و نەریتی دروستکردنە بۆ ئەم دروستکراوە، کە بە جوانی پەروەرێنە مەزنەکەش ئەمە دەزانێت، بۆیە خەمی بانگەواز و قورسی پەیامەکەی چەندە گەورە بووە، وایاننەکرد کە جوانی جلی ئەو کچۆڵەیە و زریقو باقە زەردەکەی بیرکات، بۆیە فەرمووی: بەخ، بەخ.

## ماڵێکی خاڵی

کاتێك کچۆڵەکە ئەم پێشوازییە دەبینێت، ستایشی خانەخوێ لەخۆی گۆڕی، بەم ستایشە خۆشە سامو شەرمو ترسی شکا، دەستی بە هەڵسوکەوتی سروشتی خۆی کرد کەوتە گەڕان و پشکنینی کونو قوژبنی ماڵەکە. جا کە هیچی نەدۆزیەوە سەرنجی راکێشێت، لە مامۆستای رێپیشاندەر نزیك دەبێتەوە وەك هەر پیاوێك سەیری دەکرد، بەڵکو زیادەشی بەسەریانەوە هەیە ئەوەتا دەم بەخەندەیە و دەروون گەشە، ئەوەش زاتی ئەوەی پێدا دەست بۆ مۆری پێغەمبەرایەتی

دەبات کە وەك هێلکە کۆترە لە نێوان دەفەی دوو شانیدا بەلای چەپەوە.

لێی نزیك دەبێتەوە و پێوەی دەنیشێت، لاچاوێکیشی لەوە چاوەڕوانی تووڕەبوونەکەی دەکات، بەڵام کە دڵنیا دەبێت لە عاجز نەبوونی جا دەکەوێتە یاریکردن بەو هێلکەیە لەسەر ئەو پشتە پیرۆزەیە، یاریدەکات و یاریدەکات، کەچی نە تووڕەبوونێك نە ئاخ و ئوفێکی لێنابینێت، تەنها دەبینێت باوکی لێی تووڕە دەبێت، پێغەمبەری مەزن هەڵوێستە کە بەوە کۆتایی پێدەهێنێت، دەستە پیرۆزەکانی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە بە ئومێد ئایندەیەکی گەش بۆ کچۆڵەکە داوای تەمەندرێژی لە عیبادەت و رازاوەیی زیاتری بۆ دەکات، هەر بەو شێوەش دەرچوو دایکی خالید دوای ئەوە ماوەیەکی زۆر بە ڕێزەوە ژیا.

اللهم صلى وسلم على نبي الرحمة

ورسول الخير وسيد الخلق وإمام الرفق.

## هەشتەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو:

## منداڵێکی مەزن پایەی دەروونی ئەم هونەرەی سەرکردایەتی

موسڵمان لە ئەمڕۆدا پێویستیان بە بەخۆداچوونەوەیەکی گشتگیر هەیە، لە پەروەردەی منداڵ و بایەخدانیان بە تازەپێگەیشتووان، پێغەمبەری خوا بە وتە و کردار بنەمای بۆ هەموو رەفتارێکی پەسەند و رێڕەوێکی پەروەردەی نەوجەوانان داڕشتووە، کەچی هەندێك لە پەروەرشکارانی خۆمان دەچن لە جۆن و ئیدوارد و جیمس و سمیسەوە پەروەردە وەردەگرن، ئەوان هێشتا ژیانی پەروەرشکاری یەکەمیان (ﷺ) نەخوێندووەتەوە و لەسەر شێوازی پەروەردەیی ئەو نەوەستاون و سەرنجی رێچکەکەی ئەویان نەداوە.

لە ئاراستەکردن و پەروەردەی نەوەکاندا ئەمە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە، منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا خۆڕسکانە هەڵسوکەوت دەکاتو لەگەڵ پاڵنەرە سروشتییەکاندا کار لێکدەکەن بێ هیچ سانسۆرێك، جاری وا هەیە لە باوەشی باوکیدا بە زەردەخەنەوە میز دەکات و رەفتاری ناشایستە لە بەردەم خەڵکدا بە پێکەنینەوە دەکات.

منداڵان جوانیی ژیانن و گەشیی دڵی بابە و خشڵی دڵی دایەیانن، ژیان بەوانەوە خۆشە، لەبەر خۆشگوزەرانیان رێگای سەخت دەبڕن و شەونخونی دەچێژن. باوك هەڕەتی گەنجێتی خۆی سەرف دەکات، خۆی شەکەت و ماندوو دەکات، هەموو کوونو قوژبنێکی دنیا دەبشکنێت لە پێناو پارووییەکی چەور و جلێکی جوان و جێگایەکی ئارام بۆ منداڵەکەی، کە خۆیشی وا لێدەکات زۆر دڵخۆشە.

دایکیش بۆ سەلامەتی و پارێزراویان زیاتر لە باوکەکە پەرۆشە و غەمیان دەخوات، شەوگار شەقدەکات و رۆژان بەڕێدەکات تاکە خەمی بێچووەکانیەتی، هەمیشە ئاگای لێیانە و چاودێرییان دەکات، هەر دەنگو جوڵەیەکیان خەو لە چاوی دەتۆرێنێت، بە هەر ناڵە و ئۆفێکیان چاوانی پڕ دەکەن لە فرمێسك، کە پێشدەکەنن و دڵخۆش دەبن ئەمیش لە خۆشیدا خەریکە لە کراسەکەی بێتەدەر، بەخەمو خەفەتیشیان دنیای لێ دەبێتە چاوی چۆلەکە، بۆیە سێ قات پاداشت وەردەگرێت و قاتەکەی دیکە بۆ مێردە زەحمەتکێشەکەیەتی.

## منداڵانی ئەمڕۆ گەورەی سبەینێن

باشە ئەم بچووکە تاکەی بە بچووکی دەمێنێتەوە و باوکە بەهێزەکەشی چەندیکە ئەو توانایەی بەردەوام دەبێت؟ ئەمە سوننەتی خودابیە ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفاً وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ﴾ (الروم: ٥٤). کەواتە منداڵانی ئەمڕۆ گەورەی سبەینێن و دروستکەری ئایندەن، ئەوانە سبەی جڵەوی کۆمەڵگە دەگرنەدەست و سەرکردایەتی خەڵك دەکەن و ئیدارەی وڵات دەدەن، هەر ئەم منداڵە بێگەردانەن.

دڵیان بێگەردە، سروشتیان پاکە، دەروونیان خاوێنە، (هەر نەوزادێك لە دایك دەبێت لەسەر سروشتی خاوێنی لەدایك دەبێت، ئەوە باوكو دایکە دەیکەن بە گاور و ئاگرپەرست).[1]

---

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن باب لا تبديل لخلق الله رقم ٤٥١٠.

## زەویەكی بە پیت

دڵو مێشكیان وەك زەویەكی بەپیتە بۆ چاندن، ئەوەی ئەمڕۆ تیایدا بڕوێنرێت لە ڕەوشت بەرزی و شكۆمەندی و ... سبەی دەیدورێتەوە، ئەوانە سەركردەی سالار و پیاوی بەكەڵك و زانا و پزیشك و ندازیار و هونەرمەند و سیاسی و سەركردە و قازی و فەرماندە و بیریار دەردەچن.

بایەخدان بە نەوجەوانان ڕێڕەوی سەركەوتن و ڕێگای پێشكەوتنە، هیچ گەلێك سەرناكەوێت ئەگەر منداڵەكانیان سەرنەخەن، ڕۆژگاریش نایڕوخێنێت مەگەر ئەوكاتەی منداڵەكانیان فەرامۆش دەكەن و ئاگاداریان نابن.

سەركردەی مەزنیش (ﷺ) بە وردبینی خۆی، پێگەی منداڵ و هەراش و نەوجەوان و هەرزەكار و گەنجەكانی دەزانی، بۆیە بانگخوازی گەورەكان سەرقاڵی نەدەكرد لە بایەخپێدانو پەرۆشی و فێركردنیان، هەموو وێستگەیەكیشی دەقۆستەوە بۆ ئاراستەكردن و ئامادەكردنیان بۆ ڕۆژێك كە ئەركە قورسەكەیان دەكەوێتە سەر و سەركردایەتی كۆمەڵگە لە ئەستۆ دەگرن.

بە خوێندنەوەی ژیانی سەركردە مەزنەكە و پەروەرێنە لێهاتووەكە (ﷺ) دەبینم ئەم مانایەی لە بەرچاوگرتووە، كە دەكرێت ڕێبازی ئەو (ﷺ) لە بایەخدان بە نەوجەوانانان و پەروەردەكردنیان لە چوار بنەمادا باس بكەین.

## بنەماکانی بنیاتنانی نەوەی راساڵی دەروون و هۆش و جەستەساغ

## بنەمای یەکەم: تێکەڵکردنیان بە مەجلیسی گەورەکان

سامو شکۆی پێغەمبەرایەتی و ئەو رێزە زۆرەی، رێگر نەبوو لەو کچۆڵەیە کە لێی نزیك ببێتەوە، کەواتە کەسێك چەند پلە و پایەدار و بەرێز بێت، نابێت پەردەیەکی ترسو بیم بەناوی رێز و پاراستنی پێگەوە لە نێوان خۆی و منداڵەکانیدا دروست بکات، خۆ هیچ پێگەیەك بەقەد پێگەی پێغەمبەرایەتی بەرز نییە و کەسیش ئەوەندەی ئەو بە قەدر نییە.

پێغەمبەر (ﷺ) نەوەکانی لە خۆی بڕ نەدەدا ، بە هاوەڵانیشی نەدەگوت شتی وا بکەن، بەپێچەوانەوە وەختێك خەڵكێك وای گومان دەبرد گە بازبازێنی منداڵ بە دەوروبەریدا بێزار و بێتاقەتی دەکات، تێیدەگەیاندن وا نییە و ئەو گومانە هەڵەیە، ئەو هەلی دەقۆستەوە تا بچووكو گەورەش فێری رەفتارجوانی و رەوشتبەرزی بکات، کەواتە لادانی منداڵ لە مەجلیسی گەورەکان و تێکەڵی پیاوان، رێکارێکی پەروەردەیی باش نییە، چەند رەفتارێکی باشە کەسانێك منداڵەکانیان بەشداری خزمەتی میوان و مەجلیسی هاورێکانیان بکەن، چونکە منداڵ ئەگەر هەر لە مەجلیسی هاورێ منداڵەکانیدا بێت ئەدی کەنگێ پێدەگات و فێری رەفتاری جوانی گەورەکان دەبێت؟!

## پاڵەوانانی سوژدە

ئەبوهورەیرە دەبێژێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نوێژی عیشامان دەکرد، کە دەگەشتە سووژدەبردن حەسەن و حسەین بازیاندەدایە سەرپشتی، کە سەری بەرز دەکردەوە بە هێواشی هەڵیدەگرتن و دایدەدانان، کە سووژدەی دەبردەوە دووبارەیان دەکردەوە، کاتێك نوێژی تەواو کرد یەکێکیان لەملاو ئەویدیکەیانی لەولا دانا، منیش چوومە لای و وتم: نەیانبەم بۆ دایکیان؟فەرمووی: نا، جا ڕووناکییەك هەڵیکرد و فەرمووی: بڕۆن بگەن بە دایکتان، ئەوانیش لەبەر ڕۆشناییەکەوە ڕۆشتن تا چوونە ژوورەوە).[1]

## منداڵانی مزگەوت

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (لە دوای هیچ پێشنوێژێکەوە نوێژم نەخوێندووە کورتتر و تێر و تەواوتر نوێژ بکات لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە گوێی لە گریانی منداڵێك دەبوو نوێژەکەی کورت دەکردەوە، نەبادا دایکی فریو بدات.[2]

هەر ئەنەس دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لە گریانی منداڵ دەبوو لەگەڵ دایکی لە نوێژدا، سورەتی سووك، یان سورەتی کورتی دەخوێندەوە).[3]

---

[1] أخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب معرفة الصحابة باب مناقب الحسن والحسين، رقم ٤٧٤٥.

[2] رواه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأذان باب من اخف الصلاة عند بكاء الصبي ٦٨٧.

[3] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الصلاة باب امر الأئمة بتخفيف الصلاة رقم ٧٥٩.

## پاڵەوانانی هەینی

بەریدەی ئەسلەمی دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری بۆ دەدااین، حەسەن و حسەین دەڕۆیشتن و دەکەوتن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە میمبەرەکە دابەزی و هەڵیگرتن و لەبەردەمی خۆیدا داینان، پاشان فەرمووی: خودا راست دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ (التغابن: ١٥)، ئەم دوو منداڵەم دی دەهاتن و دەکەوتن، بێتاقەت بووم، ناچاربووم قسەکانم ببڕم و هەڵیانگرم).[١]

## منداڵەکە میزی پێداکرد

لوبابەی کچی حارس دەڵێت: حسەینی کوڕی عەلی میزی بل

ە کۆشی پێغەمبەردا (ﷺ) کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کراسەکەتم بدەرێ بیشۆم و کراسێکی دیکە لەبەر بکە تا ئەو ئەشۆم، فەرمووی: (ئاوپرژێنێك بە شوێن میزی کوڕدا بەسە، بۆ کچیش دەشۆردرێت).[٢]

چی رویدا، هەرئەوەندە لە ئاوپرژێنێکی شوێنەکەی کرد و تەواو، ئیدی لەوە تێنەپەڕی، سەیری ئەو قسە شیرین و روونکردنەوە بەسوودە.

---

[١] اخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب الحظر والاباحة باب ذوي الأرحام، رقم ٦١٣٨.

[٢] اخرجه الطبراني في المعجم الكبير باب بقية اخبار الحسن بن علي رقم ٢٥٨٥.

## بنەمای دووهەم: باوەڕبوون بە تایبەتییەکانی منداڵی (یاری، گەمە، خۆشەویستی)

یاری بەشێکی جێگیری پێکهاتەی دەروونی و هۆشمەندی منداڵە، لای ئەو یاری ئیشێکی بایەخدارە، راستە ژیان لای گەورە تەسکە، بەڵام لای منداڵ تەسك نییە، لە نەریتی خەڵکدا گوزەران تاڵ دەبێت، بەڵام لای منداڵ وا نییە، ئەو یاری و گاڵتە دەکات، تورە دەبێتو بیری دەچێتەوە، شەڕ دەکات و زوو ئاشت دەبێتەوە، زویر و دڵشاد دەبێت لە ماوەیەکی کەمدا، ژیان لای ئەو یاریگایەکی گەورەیە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوەڕی بەمە هەبووە.

## قاچی لەسەر سنگی پێغەمبەرە (ﷺ)

ئەبوهورەیرە دەڵێت: بەم دوو گوێیە بیستم و بەم دوو چاوە پێغەمبەری خوام (ﷺ) دیت، بەهەردوو دەستی حەسەن یا حسەینی گرتبوو، قاچەکانی لەسەر قاچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، دەیفەرموو: بڕۆ، بڕۆ، بەرزبەرەوە چۆلەکە، جا منداڵەکە بەرز دەبووەوە تا دوو قاچی دەخستە سەر سنگی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پاشان پێی دەوت: بیکەرەوە، دەڵێت: جا ماچی کرد و فەرمووی: خوایە خۆشت بوێت، من خشم دەوێت.[1]

---

[1] اخرجه الطبراني في المعجم الكبير باب بقية اخبار الحسن بن علي رقم ٢٥٨٥.

## زەینەبۆکێ

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) یاری لەگەڵ زەینەبی کچی ئوم سەلەمە دەکرد و دەیفەرموو: زەینەبۆکێ، زەینەبۆکێ، چەند جار دەیوتەوە).[1]

## پێشبڕکێی سیانی

عەبدوڵڵای کوڕی حاریس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەبدوڵڵا و عوبەیدوڵڵا و کوسەیری کوڕی عەباسی کۆدەکردەوە و دەیفەرموو: هەرکەس پێشتر پێمان بگات ئەوە و ئەوەی دەدەمێ، دەڵێت: ئەوانیش رایاندەکرد بۆ لای و دەکەوتن بەسەر پشتو سنگیدا، جا ماچی دەکردن و باوەشی پیادەکردن).[2]

## باشترین سواریی

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتو حەسەنی کوڕی عەلی لەسەر ملیەوە بوو، کابرایەك پێی گەیشت وتی: سواریی باشترین سواری بویت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەویش باشترین سوارە).[3]

خوێنەری بەڕێز ئامادەبە بۆ خوێندنەوەی شتی سەیر، جوانترین یاری، ناسکترین سۆز، خۆشترین دڵنەوایی و لوتکەی رۆح و گیان، ئەوپەڕی سادەیی و خوشگوزەرانی ببینە.

---

[1] سەیری صحیح الجامع بکە، ٥٠٢٥ بسند صحیح.

[2] اخرجه الامام احمد في مسنده في مسند بني هاشم رقم ١٧٧١.

[3] اخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب معرفة الصحابة باب فضل الحسن بن على رقم ٤٧٥٧ صحيح الاسناد.

## زمانە سوورە

ئەبو هورەیرە دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) زمانی بۆ حسەین دەردەهێنا، ئەو منداڵە کە سوورایی زمانی دەبینی بەپەلە دەستی بۆ دەبرد.[1] سوبحانەڵڵا ئەم پێغەمبەرە رەحمەتە چییە؟ شتی زۆر سەیر و خۆشەویستانە دەکات، هەرچەندە ئەمڕۆ خەڵکانێك هەن هیچ لە مانای گەمە و گاڵتە لەگەڵ کۆرپەکانیاندا نازانن، خۆیانی لێ دەبوێرن، چونکە خۆیان لەوە بە زیاتر دەزانن کە لەڕاستییدا ئەوانە نەیانپێکاوە.

## ئاوپرژێن

منداڵ زۆر حەزی بە شەڕە ئاوو ئاوپرژێنە، سوێند بەخوا شتم زۆر خوێندووەتەوە و بیستووە و بینیوە، بەڵام وەك ئەمەم نە خوێندووەتەوە و نە بینیوە و نە بیستووە، مەحمودی کوڕی رەبیع دەڵێت: ئەوەم بیرماوە لە پێغەمبەرەوە دەمی لە دۆڵچەیەکەوە پڕ دەکرد و ئاوی دەکرد بە دەمو چاوما، هێشتا پێنجساڵان بووم.[2]

## بنەمای سێهەم: پاراستنی سەلامەتی منداڵ

پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها بە پەروەردە و ئاراستەکردن، رێگەی چاککردنی منداڵانی نەدەگرتەبەر، ئیتر هۆکارەکانی دیکەی پاراستن وازلێبهێنێت، نەخێر ئەم سەرکردە و باوکە بەسۆزە (ﷺ) بۆ سەلامەتی

---

[1] اخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب مناقب الصحابة، باب ذكر ملاعبته للحسين رقم ١٧٨ اسناده حسن.

[2] أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب العلم، رقم ٧٧.

و ئاسایشی منداڵ پەرۆش بوو، چونکە منداڵ ناخی دڵو بیلبیلەی چاوو کرۆکی گیانە. منداڵ کە دێتە دنیاوە ئاگای لە قازانجو زەرەری شتەکانی دەوروبەری نییە، رەنگە لە زۆر کار باش تێنەگات، کەواتە ئەرکی باوكو دایکە ئاگایان لە منداڵەکانیان بێتو هەمیشە خەمی سەلامەتییان بخۆن، بۆیە پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) خۆی بەشداری ئاگابوون و پاراستنی منداڵی دەکرد. ئەمەش چەند دەنکە مەروارییەکی ملوانەکەی ئاگاداربوون و پاراستنیەکانیەتی:

## قەڵای پارێزراو

ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای پەناگرتن بەخوای دەکرد بۆ حەسەن و حسەین و دەیفەرموو: باوکتان ئەم پەنایەی بۆ ئیسحاقو ئیسماعیل دەگرت: (أعوذ بکلمات الله التامة، من کل شیطان وهامة، ومن کل عین لامة).[1]

## جگە لەو دووە واز یلەوانی دی هێنا

ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنای بەخوا دەگرت لە جنۆکە و چاوی پیس، تا هەردوو سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) دابەزین، دوای ئەوە وازی لە هەموو پەناگرتنەکان هێناو هەر ئەو دووەی دەخوێند.[2]

---

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح كتاب احاديث الانبياء رقم ٣٢١٢.

[2] اخرجه الترمذي في سننه في ابواب الطب عن رسول الله رقم ٢٠٦١.

## وریای کۆرپەکانتان بن

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: کە شەو داهات یان ئێوارەتان کردەوە وریای کۆرپەکانتان بن، چونکە جنۆکە لەو وەختەدا بڵاوە دەکەن، کە ماوەیەکی شەو تێپەڕی وازیان لێبهێنن و دەرگاکان داخەن و ناوی خودا بهێنن، چونکە شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، مەشکەکانیشتان دەمبەست بکەن و ناوی خودای لێبهێنن، سەری قاپو دەفرەکانیشتان بگرن و ناوی خودای لێبهێنن، با شتێکیش بێت هەر لەسەری دانێن، چراکانیشتان بکوژێننەوە.[1]

ئەمەش بزانین بایەخدانی ئەم سەرکردە مەزنو باوکە بەسۆزە (ﷺ) بە منداڵان بەردەوامە، بۆ دوای ئەوەی وەك پیاوو ژنی سەرەش گەورە دەبن.

## کە منداڵ گەورە دەبێت

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێت: فاتمە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵای دەست ماندووبوونی خۆی دەکرد بەهۆی نانکردنەوە و بیستبووی هەندێك کەنیزەك هێنراون و ئەم پێڕانەگەیشتووە، ئەمەی بۆ عائیشە باسکرد، کاتێك هاتەوە عائیشەش بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە، دەڵێت: ئێمە لە جێگای خۆماندا پاڵ کەوتبووین ئەو هات هەستاین، فەرمووی: لە شوێنی خۆتان بن، جا هات لە نێوانماندا دانیشت، تا ساردایی قاچی دای لە سکم، فەرمووی: فێری شتێکتان بکەم باشتر بێت

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأشربة رقم ٥٣٢٠.

لەوەی داوای دەکەن؟ کە چوونە سەر جێگای خەوتن سیو سیٚ جار سبحان الله و سیوسیٚ جار الحمد لله و سیو سیٚ جار الله اکبر بکەن، ئەمە لە خزمەتکار باشترە بۆتان.[1]

## بنەمای چوارەم: متمانەچاندن لە دەروونی منداڵدا

باوەڕبوونی منداڵ بە خۆی و متمانەبوونی، ئەو پایەیە کە چەمکی پەروەردەی دروست بە دەوریدا دەسوڕێتەوە، دەبێت ئەو پەروەردە چ سوودێك ببەخشێت کە منداڵەکە بە دەروونێکی لاواز و دڵێکی لەرزۆکەوە لێیدەردەچێت، یان شەرمنو ڕاڕا و ترسنۆك دەردەچێت؟ بۆیە چاندنی متمانە لە دەروونی نەوەی نوێدا یەکێکە لە گرنگترین پایەی پەروەردەی دروست، پێغەمبەر پەروەرێنیش (ﷺ) لە چوار دەلاقەوە ئەم متمانەیەی لە دەروونی منداڵاندا دەچاند، دەکرێت هەر چواریان لە ژیانی سەرکردەی مەزندا (ﷺ) ببینین:

### أ ـ بەخشینی نازناو:

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر بە منداڵی نازناوی لێناوە.[2]

### ب ـ پاراستنی قەدر و ڕێزی کەسێتیی:

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی دەڵێت: پەرادخێکیان هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لێی خواردەوە، منداڵێکی بچووك لای ڕاستییەوە

---

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب النفقات رقم ٥٠٦٤.

[2] اخرجه ابن سعد في الطبقات الكبرى، طبقات البدريين من الأنصار، رقم ٨١٢٣.

بوو، پیاوانێکی کاملێش لەلای چەپیەوە بوون، فەرمووی: ڕۆڵە، مۆڵەتم دەدەیت بیدەم بەو پیاوانە، وتی: کەس پێش خۆم ناخەم لەو خێرەدا ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر پەرداخەکەی پێدا.[1]

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای کۆمەڵە منداڵێکدا تێپەڕی سەلامی لێکردن.[2]

## ج. نهێنی دانان لای

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لام، منیش لەگەڵ منداڵاندا یاریم دەکرد، ناردمی بۆ پێویستییەك، بۆیە لای دایکم دواکەوتم، کە هاتمەوە وتی: بۆ دواکەوتیت؟ وتم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ ئیشێك، وتی: ئیشەکە چی بوو؟ وتم: ئەوە نهێنییە، وتی: نهێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای کەس مەڵێ، ئەنەس دەڵێت: سوێند بە خوا ئەی سابت ئەگەر بە کەسم بوتایە بە تۆم ئەوت.[3]

## د. ئەرکبارکردن

ئیبن عەباس دەڵێت: منداڵ بووم لەگەڵ منداڵاندا دەڕۆشتم، دەبینم پێغەمبەر (ﷺ) لە دواوە دێت، وتم: دیارە پێغەمبەری خوا بۆ لای من دێت، دەڵێت: خێرا ڕۆشتم لە پشت دەرگای خانوویەکەوە خۆم

---

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المساقات، باب الشرب، رقم ٢٢٤٧.

[2] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب السلام، باب استحباب السلام على الصبيان، رقم ٤١٤٤.

[3] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب فضائل الصحابة ، رقم ٤٦٥٦.

حەشاردا، دەڵێت: هەستم نەکرد تا گرتمی و لە دواوە زللەیەکی نەرمی پیاکێشام و فەرمووی: برِۆ معاویەم بۆ بانگ بکە، خێرا رۆشتم بۆ لای معاویە و وتم: برِۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویستی پێتە.[1]

## گەوهەری محەمەدی

پێویستی منداڵ بۆ گاڵتەو یاری، وەك پێویستی گەورە وەهایە بۆ سەروەت و ئیش، بیرۆکەی منداڵ کاڵە، گیانیشی ناسکە، دەروونیشی نازدارە، جگە لەوەی بە خۆشەویستیەك داپۆشیت و یارییەك بگونجێت لەگەڵ ساوایی و بێگەردیدا بەهیچ تێر نابێت، هەرکەسیش دەخوازێت منداڵێکی هۆشیار و لەشساغ و متمانەبەخۆ پەروەردە بکات، دەبێت لەو سەرەوە دابەزێتە خوار بۆ ناو منداڵەکانی، بیانکەنێنی و یارییان لەگەڵ بکات، ئەوجا وردە وردە بەرزیان بکاتەوە بەرەو سەر تا پێبگەن و مێشکیان فراوان بێت و ئەزموون پەیدا بکەن.

## گەوهەری هەشتەم

سەعیدی کورِی ئەبو راشید دەڵێت: عەلی کورِی مورِە بۆی گێرِاونەتەوە: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) چوون بۆ دەعوەتێك دەبینن حسەین لە رێگا یاری دەکات، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە خەڵکەکە پێشکەوت، باوەشی بۆ کردەوە، منداڵەکەش بەملاولادا رایدەکرد و

---

[1] اخرجه احمد في مسنده رقم ٢٩٨٤ بسند صحيح. حسن.

پێغەمبەریش دەیڕفاند تا گرتی، جا دەستێکی خستە ژێر چەناکەی و ئەو دەستەکەی خستە سەر سەری و ماچی کرد و فەرمووی: حسەین لە منە و منیش لە حسەینم، خوا ئەوەی خۆشبوێت کە حسەینی خۆشدەوێ، حسێن نازدارێکە لە نازدارەکان (حسين سبط من أسباط).[1]

## هەشتەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو: منداڵێکی مەزنە

جا ئەی سەرکردە جارێك دابەزە بۆ لای منداڵەکانت و بۆ لای خۆت بەرزیان بکەرەوە.

﴿ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخاً﴾ (غافر : ٦٧)

(ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلاً) واتە منداڵ.

(ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ) ئەو حاڵەتە کە دەبێتە خاوەنی هێز و هۆش.

(ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخاً) (الشيخ) ئەوەیە چل ساڵی تێپەڕاندبێت.[2]

---

[1] اخرجه ابن ماجة في سننه في كتاب المقدمة باب فضل الحسن والحسين، رقم ١٤٤ اسناده

[2] انظرزبدة التفسير للأشقر.

# بەشی نۆهەم
# ئەوەیە خۆشەویستیی

ئەگەر بتوانین بگەینە دڵان، پارچەکانی لەش هەموو گوێڕایەڵ دەبن، جا ئەگەر خەڵك خۆشیان ویستی و لەدڵیاندا جێگەیان کردیتەوە، ئیتر دەبیتە براگەورە و قسەبیستراو و سەرکردەی بە گوێکراو، بەڵام گەر ئەو خۆشەویستییە نەبوو، ئەوا نە برا گەورە و نە سەرکردەیت.

## نهێنی گەورەی سەرکردەی گەورە

ئەنەس دەڵێت: لە شەڕی ئوحوددا لەناو مەدینەدا ژاوەژاوێك بڵاوبووەوە وتیان: محەمەد کوژراوە، تا هاتوهاوار لەوپەڕی مەدینەوە بەرزبووەوە، جا ئافرەتێکی ئەنساری پشتوێنی بەستبوو، دەرچوو، بە تەرمی کوڕ و باوكو مێرد و براکەی پێشوازی کرا، نازانم یەکەمجار بە کامیان گەشت کە بەلای هەموویاندا تێپەڕی وتی: ئەمانە کێن؟ وتیان: باوکتو برا و کوڕ و مێردەکەتن؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بەسەرهاتووە؟ وتیان: لەپێشەوەیە، چوو تا گەشتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، چمکی کراسەکەی گرتو وتی: باوكو دایکم بە قوربانت، ئەی پێغەمبەری خوا کە تۆ سەلامەت بیت گوێ نادەمێ کێ تیادەچێت.[1]

ئیسماعیلی کوڕی محەمەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسیش دەڵێت: ئافرەتێکی ئەنساری لە تیرەی زوبیان مێرد و براکەی کوژران، کاتێك سەرخۆشییان لێکرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی لێهاتووە؟ وتیان: دایکی فلان، ئەو باشە، وتی: پیشانمدەن با بیبینم، پێیان پیشاندا، جا وتی: هەموو بەڵایەك بەبێ تۆ ئاسانە.[2]

هەروەها عیکرەمەش دەڵێت: کە هەواڵ لە ژنانی مەدینە دواکەوت، هاتنە دەرەوە بۆ پێشوازی، گەشتنە دوو پیاو کوژرابوون و بەسەر حوشترێکەوە بوون، ژنە ئەنسارییەك وتی: ئەو دووە کێن؟ وتیان: فلان

---

[1] اخرجه الطبراني في المعجم الأوسط باب الميم من اسمه محمد رقم ٧٦٦٧.

[2] اخرجه البيهقي في دلائل النبوة في تفسير سورة البقرة، باب ما جرى بعد انقضاء الحرب و.... رقم ١١٨٩ وانظر سيرة ابن هشام ١٠٥/٣.

و فلآنن، برا و مێردی بوون، یا مێرد و کوڕی بوون، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی لێهاتووە؟ وتیان: زیندووە، وتی: ئیتر قەیناکا، خودا لە بەندەکانی شەهید دەستەبژێر دەکات، دەڵێت: جا ئەم ئایەتە قورئانییە رێکی قسەکەی ئەو دابەزی: ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاء﴾ (آل عمران : ١٤٠).[1]

## خوێندنەوەی دەقەکان

ئافرەت دروستکراوێکی ناسکە، زۆریش هەستیارە و سۆزی سەرفرۆ دەکات، خودا دڵی پڕکردووە لە بەزەیی، ئەوەش سەیر نییە، چونکە دووگیانی و سەرپەرشتی کۆرپەی شیرەخۆر و پەروەردەی منداڵی کەوتووەتە سەر ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغاً إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (القصص : ١٠).

خاوەنی خۆشەویستیەکە لەسەرووی هەموو خۆشەوییستییەکەوەیە، دڵبەستێکە کە هیچ دڵبەستەیەکی پێناگات، خودا دڵی پڕ کردووە لە رەحمو سۆز، بەشێوەیەك کە بەشی ئاواییەك بکات.

بەرامبەر مێردە خەمڕەوێنەکەی دڵبەستەییەکی هەیە، بەڵام چۆن دڵگیرییەك؟ کە لێی بەدوورە زۆری بیر دەکات، کە نزیکیشیەتی جۆش‌و خرۆشی نزیکیەکەی مەستی دەکات، هەر بۆ ئەوە لێی دوورنەکەوێتەوە ماڵ‌و سەروەتی دەبەخشێت، هەموو ژیانی لە خزمەتیدا دادەنێت.

---

[1] اخرجه ابن ابي حاتم في تفسير في تفسير سورة البقرة، قوله تعالى (وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاء) رقم ٤٢٩١، وقال ابن حجر في العجاب ٧٦٠/٢ رجاله رجال البخاري.

براکەشی رۆڵەی باوکو دایکیەتی، لە سکی دایکی و پشتی باوکیەتی، لە دڵنشینیدا ئەوپەڕی نزیکە پێکەوە پێگەیشتوون و ژیانیان لە یەك ئاڵاوە، بۆیە خۆشەویستیەکی هەمیشەیی بۆی هەیە، تەنانەت با ببێتە خاوەن ژنو منداڵیش، چونکە خۆشەویستیەکەی رەسەنە و زێڕێکی خاڵسە بە تەپوتۆز و تێپەڕینی رۆژگار ژەنگ هەڵناهێنێت.

باوکیشی پیاوی یەکەمی ژیانیەتی، کە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە یەکەم پشتیوانی لاوازییەکانی ئەو بووە، پایەیەك بووە بۆ هێز و بازووی و نشینگەی سۆز و نازی بووە، بە پێکەنینی دڵشاد دەبێتو لە ئامێزیدا هەست بە دڵنیایی دەکات، ئەو سەرپەرشتیار و پارێزەر و راستکەرەوە دڵسۆزەکەیە بۆی، هەموو ژیانی بۆ خۆشگوزەرانی ئەو بەختکردووە، گیانی شیرین بەخت ئەکات تا ئەم ئازارێك نەچێژێت.

دایکیشی منداڵەکەی بە پێستی سکی هەڵگرتووە و سی مانگ یان زیاتر لە کۆشیدا بووە، نۆ مانگی نیشتەجێی ناو سیکی بووە و بەشداری بەشەخۆراکی بووە، کە هاتە دەریشەوە دوو ساڵ لە باوەشیدا ئەیلاوێنێتەوە و دەستی دەکاتە جۆلانە بۆی و سەری نزیك سنگی دەبێت خۆشەویستی دەرخوارد دەدات و نۆشی دەکات.

کە دەڕوات چاوی لەسەریەتی، کە باوەشی پیا دەکات وەك بڵێی رازی دڵی بۆ دەدرکێنێت، خۆزگە هەر لەناو سکمدا بوای، چونکە نزیکتر بویت لە ناخی دڵمەوە، ئەی ئومێد و هیواکەم و مایەی بەختەوەری دەروون و زەردەخەنەی لێوم! گیانم قوربانی گریانەکەت بێت ئەی خۆراکی گیانو ژین.

ئەو ماوە مێژووییەی ژنە ئەنسارییەکەی تێدا ژیاوە کە باسی بەجەرگی و ئازایەتییمانکرد، باو بووە کە کۆستێك دەکەوت شیوەنێك دەبوو، ژنانی ئەو سەردەمە یەخەیان دادەڕی و بە روومەتیاندا دەکێشا، ئەمە بەشێك بووە لە کەلتووری کۆمەڵگە، کە هێشتا کاریگەرییەکە تا کاتی روودانی ئەو داستانەش هەر مابوو.

کەچی ئەو ژنە ئەنسارییە دەبینین گشت دابونەریتەکان تێدەپەڕێنێت، بەسەر ئازار و خەمدا باز دەدات، بەسەر برینی کۆست کەوتنی مێردەکەیدا دەفڕێت بەبێ ئەوەی فزەیەکی لێوە بێت، باوکیشی دەکوژرێت باوکەڕۆیەك ناکات، پێشوازی تەرمی براکەی دەکات و دڵی داناخورپێت و زمانی لاواندنەوەیەك ناچڕێت.

گوێبیستی هەواڵی سەختو جەرگبڕی خەڵتانی خوێنی کوڕەکەی لەسەر زەوی ئوحوددا دەبێت، کەچی نە چاوی فرمێسکێکی لێدەبارێتو نە دەیکێشا بە کوڵمیدا.

تەنها دەیڵێتەوە: ئەی پێغەمبەری خوا چی لێهاتووە.

چونکە پێغەمبەری خوا، خۆشەویستترین خۆشەویستو نزیکترینی نزیکەکان و ئازیزترینی ئازیزان و هاوڕێترین هاوڕێیە.

بۆیە کە دڵنیا دەبێتەوە ئەو سەلامەتە و دوورە لە ئازار و گیانی پارێزراوە و جەستەی تەندروستە، خەیاڵاتی خۆشەویستانی دیکەی (مێرد، باوك، برا، کوڕ) دێت بە بیردا، بەڵام ئازاری لەدەستدانیان سووك دەبێت لەبەر سەلامەتی مەزنترین و ئازیزترین خۆشەویست.

دەڵێت: هەموو کۆسکەوتنێك جگە لە تۆ ئاسانە ئەی پێغەمبەری خوا

دەشڵێت: گوێنادەمێ کە تۆ سەلامەتیت کێ لەناوچووە.

دەشڵێت: (گوێنادەمێ چونکە پەروەردەگار خۆی شەهیدان بژاردە دەکات)، بەهیچ شێوەیەك ئەم گەورەییە بە وشە دەرنابڕرێت و تەعبیری لێنادرێت، قەڵەم کۆڵۆ وشە بزر و مانا پڕ. خودایە سا لە هاوەڵانی پێغەمبەرەکەت خۆشبە و پایەیان بەرز و بڵند بکە و شەرەفی هاوڕێیەتیشیان ببەخشە بە ئێمە لە بەهەشتە نەبڕاوەکەتدا.

## نۆههم هونهرهی سهرکردهی سهرکهوتوو: خۆشهویستییهکی خاوێن و بێ سنووره پایهی دهروونی ئهم هونهرهی سهرکردایهتی

دهی با زهمهن بۆ دواوه بگهڕێنینهوه بۆ مانگهشهوێکی هێدی پاکی بکهرهوه له بتپهرستی و پهرێزهکانی، ئهو له ئهشکهوتی حهڕادایه و به دهروونێکی بێگهردی پرشنگدارهوه خهڵوهتی کردووه، دوور له غهڵبهغهڵبی مهککه و خهڵکه نوقومبووهکهی له ههراو بهزمو رابواردندا. بێدهنگی باڵی بهسهر ئهشکهوتهکهدا کێشاوه، محهمهدی نازداریش تهنها خۆیهتی و گیانێکی بێگهرد و دهروونێکی ئارام.

له پڕێکدا دهنگی جوبرهئیل بێدهنگی ئهشکهوتهکه دهشڵهقێنێت و تاریکایی ئهشکهوتهکه پڕ نوور دهکات.

خودا دڵی پێغهمبهره خۆشهویستهکهی رادهگرێت، نهبادا بههۆی ئهو رووداوه کتوپڕه سهیرهوه له لێدان بکهوێت و هۆشی تێکبچێت.

جا جوبرهئیل جهستهی پهیامبهری نوێ دهگرێتو دهیگوشێت، پێی دهڵێت (إقرأ)، محهممهد (ﷺ) خۆی دهگرێت و وهڵامی دهداتهوه: (خوێندهوار نیم).

مهبهستی رهتکردنهوهی فهرمان و قبوڵنهکردنی داواکه نییه، دهیهوێت حاڵی خۆی دهربخات، چونکه ئهو وهك خودا ویستبووی نهخوێندهوار بووه، بۆ ئهوهی دڵی نشینگهی وهحی نورانی و فهرموودهی قورئانی بێت، خاڵی له خهیاڵی شاعیری و پهخشانی ئهدیب و حیکمهتی ئادهمیزاد، ئهمهی خودا بۆ پێغهمبهرهکهی دهویست پڕ بوو له حیکمهت و نیازی دیکه. (خوێندهوارنیم)

نازانم بخوێنمەوە، فریشتە دووبارەی دەکاتەوە و پێغەمبەریش هەروا وەڵامی دەداتەوە، بە دڵێکی جێگیری بتەوەوە تا سێ جار.

جا سەروەری فریشتەکان پیتە بەراییە نوورانییەکان دەخوێنێتەوە بەسەر سەروەری ئادەمیزاددا، کە جاڕنامەی پەیوەستی ئاسمانی بڵندە بە وزە و بە بۆنی خۆشەوە، ئەوە لە دوای ماوەیەکی زۆر لە دابڕان پەیوەستبوونەوەی ئاسمان و زەوییە، بە نووری وەحی و بزیسکەی یەکخواپەرستیی. ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)﴾ (العلق:١ـ ٥).

پرشنگی ئەم نوورە دەدات لە دڵێکی گوێڕایەڵی فەرمانبەردارو هەرچی تاریکیی هەیە تیایدا رۆشنی دەکاتەوە و هەموو پەڵەکان دەسڕێتەوە.

ئای چ ساتێکی بە شکۆ و شیرینە.

فریشتەکە بە وەحی دێتەگۆ و گشت کونو قوژبنێکی ئەشکەوتەکە و هەموو زەڕەیەکی جەستەی پێغەمبەرە تازەکە پرشنگدار دەبن، ئەمە جاڕنامەی پێغەمبەرایەتیە لە رازاوەترین شێوە و حاڵیدا.

ئەم ئەرکبارییە مەزنترین ئەرکبارکردنی مەزنترین مرۆڤە.

داوا لە پێغەمبەرە نوێیەکە دەکرێت بانگەواز بگەیەنێت و پەیام ببات بۆ کەسو کار، خزمو عەشیرەت، خەڵکی مەککە، ناو دوورگە، بەڵکو بۆ هەموو بوونەوەر، بە مرۆڤو جنۆکەوە، داوای لێکرا ئەو بیروباوەڕی بتپەرستی و بەتاڵ و نەفامییەی کە لە دەروونی خەڵکیدا ریشەی داکوتابوو لەو سەردەمەدا بگۆڕێت، بگەڕێنەوە بۆ ئاینە بێگەردەکەی ئیبراهیم.

## ئەمە چ خۆشەویستی و ئەرکبارکردنێکە

پێغەمبەرە تازەکە (ﷺ) تەمەنی گەشتووەتە چل ساڵان، ئەی دەبێت چەندێکی تەمەن مابێت تا ئەو ئەرکەی کەوتووەتە سەر بەجێی بهێنێت، بیست یان سی! ئای بیست ساڵ و سی ساڵ لە ژیانی گەلان‌و بزاوتنی مێژوودا چەندە کەمە؟

خوێنەری خۆشەویست ئێستا دەمەوێت بتگوازمەوە بۆ ماوەیە لەسەرتر واتە بۆ دوای بیست و سێ ساڵ لە دوای ئەرکبارکردنەکە، بە دیارییکراویش ساڵی یازدەی کۆچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ شارە بۆنخۆشەکەی مەدینە و بۆ رۆژی دوازدەی مانگی رەبیعی یەکەم.

ئا ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، پیاوە ئەرکبارە مەزنەکە پەردەکە لا دەداتەوە و سەرنجی شوێنکەوتە و شاگردەکانی دەدات، کە نوێژ دەکەن و بە ڕیز ڕێك راوەستاون، نوێژێکی پڕ لە خشوع‌و رووکردنە قیبلەیەکی جوان، ئا لەو ساتەوەختەدا دوو لێوەی دەکاتەوە و دانەکانی زەردەخەنەیەکی پرشنگداری لێ دەبارێت، چونکە ئامانجەکەی هاتووەتە دی و تەبلیغەکەی گەیاندووە و باوەڕی لە دڵەکاندا چاند، کەواتە وەختی ئەوە هاتووە پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) بحەوێتەوە و چاوانی لێکنێ و گیانی بسپێرێت بە پەروەردگاری.

بەم دوو دەیەی ژیانی پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ) چی روویدا؟ چۆن تەبلیغ تەواو بوو؟ چ ئەنجامێکی دڵخۆشکەر دەستی ئەم پیاوە ئەرکبارە لە تەبلیغکردنەکەدا کەوت؟ ئا لەم ماوە کورتەدا.

ئەم سەرکردە مەزنە (ﷺ) لە قیامەتدا ئەنجامی تەواوی دەستدەکەوێت (میللەتەکانم نیشاندرا، پێغەمبەرێك تێدەپەڕی و پیاوێکی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریش هەبوو تاقمێکی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریشم دەدیت کەسی لەگەڵ نەبوو، قەرەباڵخیەکی گەورەم بینی، ئاسۆی پڕ کردبوو، ئومێدم خواست ئەوە ئوممەتی من بێت، وترا: ئەوە مووسا و گەلەکەیەتی، دوایی پێموترا سەرنجدە، قەرەباڵخییەکی زۆرم بینی، ئاسۆی گرتبوو، پێموترا: بەملاولاشدا سەرنجدە، قەرەباڵخیەکی دیکەم بینی، ئاسۆی پڕکردبوو، وترا ئەوانە ئوممەتی تۆن، لەگەڵ ئەمانەدا حەفتا هەزار کەس هەن بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت).[1]

## ئەمە خۆشەویستییە

پیاوێك بگاتە ناو قووڵایی دڵی شوێنکەوتووانی و خۆشەویستی لە ناخی دەروونیاندا جێگیر کردبێت، دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا زۆر شت بکات، کەواتە دەبێت چ گۆڕانکارییەکی دروستکردبێت و چ شوێنەوارێکی لای ئازیزانی بەجێهێشتبێت؟

هەموو ویستێکی دنیایی، یان دابونەریتێکی کەڵەکەبوو، یان حەزێکی بەجۆشی دەروونی، یان بەدکارییەك کە ساڵانێك بوو لەسەری گۆشکرابوون، تەنها بەیەك وشە کە لە دەمی دەردەچوو، یان ئایەتێك دەیخوێندەوە ئەوانە هەموویان لادەبران و دەسڕرانەوە، ئا ئەمە روویدا

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الطب باب من يرق، ٥٤٤٠.

و ئەمەش مەزنترین نهێنی سەرکردایەتییە و بەهێزترین ڕێگای کاریگەریە، چونکە تۆ ئەگەر توانیت بگەیتە دڵان، جەستە تەنها بەڵێی بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر گیانت رامکرد لەش تەنها ئامێرێکی گوێڕایەڵە، کە خەڵك خۆشیویستی، لە دڵیاندا جێگەیان کردیتەوە، ئیدی لای گەورە و بچووك بە گوێکراو و سەرکردە و چاولێکراویانی، ئەگەر خۆشەویستیش نەبوو تۆ نە گەورە و نە سەرکردەیت.

ئەمەش چەند لیزگ و جۆگەلەیەکی ئەو خۆر و دەریای خۆشەویستیەیان، کە بۆ هەموو کەسێك دەست نادات.

## یەکەم خۆشەویست

عائیشە سەبارەت بەو ئازار و ناڕەحەتییانەی ئەبوبەکر کە لە پێناوی خوادا تووشی هاتووە دەڵێت: جارێك بتپەرستەکان هەڵشاخان بە ئەبوبەکر و موسڵماناندا، ئەملاولای مزگەوتیان لێگرتن و کەوتنە لێدانێکی سەختیان، ئەبوبەکریان خستە ژێر و هەر زۆریان لێدا، عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی خراپەکار لێی نزیکبووەوە و بە هەردوو نەعلە پینەکراوەکانی کێشای بە دەموچاویدا و خۆی خستە سەر سکی ئەبوبەکر و لێی دەدا تا دەموچاو و لووتی لەیەك جیانەدەکرانەوە، ئەوجا هۆزی تەمیم هاتن ئەو بتپەرستانەیان لە کۆڵ ئەبوبەکر کردەوە، هۆزی تەمیم ئەبوبەکریان خستە عەبایەکەوە و تا ماڵەوە هەڵیانگرت و گومانیان نەبوو کە مردووە، بۆ ئێوارە ئەوجا کەوتە قسەکردن و وتی: لە کوێیە؟ وتیان: لە ماڵی ئەرقەمە، وتی: دەی نەزری خودا لەسەرم

بێت کە خواردن و خواردنەوە دەم لێنادەم تا دەمبەنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کە بردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوەشی پیاکرد و ماچی کرد، موسڵمانانیش باوەشیان بەودا کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەواو بەزەیی پیادا هاتەوە و ناڕەحەت بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە باوكو دایکمەوە بەقوربانت بم، هیچم نییە جگە لە دەموچاوم، ئەو بەدکارە پیایدا کێشاوە، ئەوە (بوڕە)ی دایکمە لەگەڵ کوڕەکەیدا هاتووە، تۆش موبارەکی بەڵکو بانگی بکەیت بۆ لای خوا و لە پەروەردگاریش بپاڕێیتەوە بەشکم لە ئاگر رزگاری بکات بەهۆی تۆوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی پاڕایەوە و بانگیشی کرد بۆ لای خودا، ئیتر موسڵمان بوو).[1]

احبك لا تفسير عندي لصبوتي أفسِّر ماذا؟ الهوى لا يفسر

## فرمێسکی شادمانی

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە بەیانیان و ئێواران دەهات بۆ لای ئەبوبەکر، تا ئەو رۆژەی خوای گەورە مۆڵەتی بە پێغەمبەرەکەی دا بە کۆچ و دەرچوون لە مەککە و ناو خزمانی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە قریقەی نیوەڕۆدا هات کە پێشتر لەو کاتەدا نەدەهات، دەڵێت: کە ئەبوبەکر بینی، وتی: شتێك روویداوە بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم کاتەدا هات، کە هاتە ژوورەوە، ئەبوبەکر

[1] السيرة النبوية لابن كثير، ٤٣٩: ٤٤١ وانظر البداية والنهاية ٣٠/٣.

له جێگاكەی خۆی هەستا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشت، تەنها من و ئەسما لای بووین، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: با ئەمانە دەرچن، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە كچەكانمن و خەمت نەبێت چی هەیە بە باوكو دایكەوە بە قوربانت بم؟ فەرمووی: پەروەردگار مۆڵەتی دەرچوونو كۆچكردنی پێداوم، جا ئەبوبەكر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاوڕێتم؟ فەرمووی: هاوڕێمی.

عائیشە دەڵێت: سوێند بە خوا هەرگیز نەمزانیبوو كەس لە خۆشیدا بگری، تا ئەبوبەكرم ئەو ڕۆژە دی دەگریا.

پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم دوو سواریەم حازر كردووە بۆ ئەم ڕۆژە، ئەوجا عەبدوڵڵای كوڕی ئورەیقیت كە هێشتا بتپەرستبوو بەكرێیانگرت تا دەلیلیان بێت لە ڕێگادا، هەردوو سواریەكەیان لا دانا بۆ ئەوەی خزمەتیان بكات تا كاتی كۆچكردن.[١]

طفح السرور علي حتى أنني من فرط ما قد سرني ابكاني

## دەترسم نەتبینمەوە

عائیشە دەڵێت: كابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، تۆم لا لە خۆم خۆشەویستتری و لە ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان و باوكو دایكشم خۆشتر دەوێیت، كە لە ماڵ دەبمو یادت دەكەم، ئارام ناگرم تا دێم بۆ لاتو دەتبینم، كە یادی

---

[١] اخرجه اسحاق بن راهوية في مسنده في باب زيادات عروة بن زبير رقم ١٠٣٢ قال الألباني صحيح.

مردنی خۆم و تۆش دەکەمەوە، دەزانم کە تۆ چویتە بەهەشت بەرز دەکرێیتەوە بۆ لای پێغەمبەران و منیش چوومە بەهەشت دەترسم کە نەتبینم، پێغەمبەر (ﷺ) هیچ وەڵامی نەدایەوە، تا جوبرەئیل بەم ئایەتەوە دابەزی: ﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً﴾ (النساء : ٦٩).[1]

بكت عيني غداة البين دمعاً    واخر بالبكا بخلت علينا

فعاقبت التي بالدمع ضنت    بأن أغمضتها يوم التقينا

## قژی دەتاشی

ئەنەس دەڵێت: (پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) سەرتاش سەری دەتاشی، هاوەڵانی بە دەوریدا دەسووڕانەوە، نەیاندەویست تەڵە موویەکی بکەوێتە سەرزەوی، پیاوێکیان هەڵیدەگرت).[2]

## هاوەڵی هەردوو دنیا

رەبیعەی کوڕی کەعب دەڵێت: (لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەو دەمامەوە، ئاوی دەستنوێژ و پێویستی دیکەم بۆ دەهێنا، جا پێی وتم: داوا بکە، وتم: داوای هاوەڵێتیت دەکەم لە بەهەشتدا، فەرمووی: ئەی

---

[1] اخرجه الطبراني في المعجم الصغير باب من اسمه احد رقم ٥٢ وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ٧/١ رجاله الصحيح.

[2] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل باب قرب النبي من الناس، رقم ٤٤١٣.

جگە لەوە؟ وتم: هەر ئەوە، فەرمووی: دەی بە سوژدەبردنی زۆر یارمەتیدەرم بە.[1]

ومن عجب أني احن اليهم | فأسأل عنهم من لقيت وهو معي
وتطلبهم عيني وهم سوادها | ويشتاقهم قلبي وهم بين اضلعي

## لە ژیانیدا حەزی لە کولەکە بوو

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: بەرگدروویەك دەعوەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردبوو بۆ خوانێك کە دروستیکردبوو، ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) رۆشتم بۆ ئەو خوانە، شۆرباو نانێکی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزیککردەوە،، کە کولەکە و گۆشتە وشکەی تێدابوو، پێغەمبەری خوام بینی (ﷺ) بۆ کولەکەکان دەگەڕا لەملاولای قاپەکەدا، ئیتر لەو رۆژەوە حەزم لە کولەکەیە.

موسلیم لە گێڕانەوەکەیدا ئەمەی بۆ زیادکردووە: سابت دەڵیت: گوێم لە ئەنەس بوو دەیوت: ئیتر هەر چێشتێکم بۆ لێبنرایە و بتوانرایە کولەکەی تێبکرایە تێمدەکرد.[2]

---

[1] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الصلاة، رقم ٧٩١.

[2] اخرجه مسلم في كتاب الأشربة باب جواز اكل المرق، رقم ٣٩١٦.

## بۆنخۆشترین بۆن

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە ناومان و لامان نیوەڕۆژە خەوێکی کرد، جا عەرەقی کرد، دایکم شووشەیەکی هێنا دڵۆپەی عەرەقەکەی تێدەکەوت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە هەستا فەرمووی: دایکی سولەیم ئەوە چیی دەکەیت؟ وتی: ئەو عەرەقەی تۆ دەکەینە ناو (بۆن)ەکانمانەوە کە بۆنخۆشترین بۆنە.[1]

## شەربەتی سوور

سەفینەی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەڵەشاخی گرتو پاشان فەرمووی: ئەم خوێنە ببە بیشارەوە لە ئاژەڵ و باڵندە، یان وتی: لە خەڵكو ئاژەڵ، (ئەبو فدەیك بەگومانە)، دەڵێت: منیش: دوورکەوتمەوە و خوێنەکەم خواردەوە، دەڵێت: پاشان لێی پرسیم، منیش پێموت کە خواردوومەتەوە، ئەویش پێکەنی.[2]

## کوشتارگەی عاشقان

وەختێك مەرگ دێتو کوشتن دەردەکەوێت و لە ئاسۆوە کوشتارگە دەبینرێت، لەو وەختانەدا خۆشەویستی و پەرۆشی منداڵ دەپێچرێتەوە با زۆریش خۆشەویست بێت، هی برا و هاوسەریش رادەماڵرێن با ئازیز و بەقەدر و سەنگینیش بن، بەڵام ئەگەر خۆشەویستی ریشەدار و

---

[1] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائلن باب طيب عرق النبي والتبرك رقم ٤٤٢١.

[2] اخرجه البيهقي في سنن الكبرى في كتاب النكاح، باب تركه الانكار على من شربه بوله ودمه رقم ١٢٥٤٦.

لەناخەوە بێت، لە هەموو ناڕەحەتییەکدا ئامادەیە و لە ساتە سەختەکاندا دەردەکەوێت، هاوەڵانیش لە سەرەمەرگیشدا خۆشەویستیان ئامادەبوو و لێیان نەدەبڕا، چۆن لێیان دەبڕێت خۆ ئەو لایان لە گیانیان شیرینترە.

## کوشتارگەی عاشقان (١)

حیبانی کوڕی واسیع لە چەند بەساڵاچوویەکی خزمانی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا ریزی هاوەڵانی ڕێکدەخست، رمێکیشی بەدەستەوە بوو، خەڵکەکەی پێ ڕاست دەکردەوە، بە لای سەوادی کوڕی غەزیەی هاوپەیمانی بەنی عودەی کوڕی نەجاردا تێپەڕی، دەڵێت: لە ریزەکە لایدابوو، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) تیرێکی دا لە سکی و فەرمووی: ڕێکبە ئەی سەواد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئازارت دام، تۆش خودا بۆ حەق‌و دادگەری ناردویتی، کەواتە حەقەکەم بدەرەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: حەق بکەرەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ کە لێت دام کراسەکەم پێوە نەبوو، دەڵێت جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سکی خۆی دەرخست و فەرمووی: حەقت بکەرەوە، دەڵێت باوەشی کرد بە سکیدا و ماچی کرد، فەرمووی: سەواد بۆ ئەمەت کرد؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم بۆ ئەوەی دەیبینیت و لە کوشتنیش دڵنیا نیم، بۆیە ویستم لە دوا دیدارم لەگەڵتدا پێستم بەری پێستت بکەوێت، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای خێری بۆ کرد و لێی خۆش بوو.[1]

---

[1] اخرجه ابو نعيم الأصفهاني، في كتاب معرفة الصحابة، باب السين رقم ٣١٣٥ وقال الألباني: اسناده حسن.

## کوشتارگەی عاشقان (٢)

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا خەڵك لە چواردەوری پێغەمبەر (ﷺ) هەڵهاتن، بەڵام ئەبو تەڵحە لەبەردەمیدا خۆی بە جبەکەیەوە پێچابوو، ئەبو تەڵحە پیاوێکی تیرئەندازی زۆر بەدەستوبرد بو، ئەو ڕۆژە دوو یان سێ کەوانی شکاند، پیاو هەبوو بە باخەڵێك تیرەوە بەلایدا تێدەپەڕی، دەیفەرموو: هەڵیبرژێرە بۆ ئەبو تەڵحە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری بەرزکردەوە و بۆ خەڵکەکەی دەڕوانی، ئەبو تەڵحە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوكو دایکم بەقوربانت بن، سەر بەرز مەکەرەوە نەوەك تیرێك بتپێکێت، گیانم لە پێش گیانتەوەیە.[1]

| | |
|---|---|
| دعني امسح فوق الروض اخفاني | فالنار موقدة من حر اشجاني |
| نسيت في حبكم اهلي ومنتجعي | فحبكم عن جميع الناس الهاني |

## کوشتارگەی عاشقان (٣)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سریەیەك لە هاوەڵانی نارد، هەندێکیان کوژران، خوبەیبی ئەنساری بەدیل گیرا لەگەڵ ئیبنودوننە، کاتێك زەیدیان برد بۆ کوشتن، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب پرسیاری لێکرد: ئەی زەید سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا پێت خۆشە ئێستا محەممەد لە شوێنی تۆبوایە و بدرایە لە گەردنی و تۆش لەناو کەسوکارتدا بوویتایە؟

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، باب مناقب ابي طلحة، رقم ٣٦٣٠.

وتی: بەخوا حەزناکەم ئێستا محەممەد لەو جێگەی خۆی کە تیایەتی دڕکێك ئەزیەتی بدات و من لەناو کەسوکارم دانیشتبم، ئەبو سوفیان وتی: کەسم نەدیوە کەسێکی خۆشبوێت وەك هاوەڵانی محەممەد موحەممەدیان خۆشدەوێت.[1]

| | |
|---|---|
| شكا ألم الفراق الناسُ قبلي | ورُوِّع بالنَّوى حيٌ و ميّتٌ |
| وأمَّا مثل ما ضمت أضلعي | فأني ما سمعتُ ولا رأيتُ |

## کوشتارگەی عاشقان ( ٤ )

عائیشە دەڵێت: کە ئەبوبەکر گەشتە سەرەمەرگ، وتی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ وتیان: ڕۆژی دووشەممەیە، وتی: ئەگەر ئەمشەو مردم مەمهێڵنەوە بۆ سبەی، چونکە خۆشەویسترین شەو و ڕۆژ لای من ئەوانەن کە نزیك بم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) .[2]

## کوشتارگەی عاشقان ( ٥ )

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعسەعە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کێ هەواڵم بۆ دەزانێت کە سەعدی کوڕی ڕەبیع چی لێهاتووە؟ کابرایەکی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من، ڕۆشتو گەڕا بەناو کوژراوەکاندا تا سەعدی بە

[1] اخرجه ابو نعيم الأصفهاني، في كتاب معرفة الصحابة، باب الزاي، ٢٦٣٧.

[2] رواه احمد في مسنده في مسند عشرة المبشرين بالجنة، رقم ٤٧ وقال احمد شاكر اسناده صحيح.

برینداری دۆزییەوە لە دوا دوایی ژیانیدا بوو، وتی: ئەی سەعد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردووم بگەڕێم بزانم تۆ زیندوویت یان مردووی؟ وتی: من لە مردووان دەبم، سەلامم بگەینە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێی بڵێ: سەعد دەیوت خودا لەبری ئێمە باشترین پاداشت کە لەبری ئوممەتان دەیدات بە پێغەمبەران بیداتەوە، سڵاویشم بگەیەنە بە خزمانت و پێیان بڵێ: سەعد پێی دەوتن لای خودا هیچ مەعزەرەتێکیان نییە تا چاوتان ببینێت و زیندوو بن ئەگەر زەفەر بە پێغەمبەرەکەتان ببرێت.[1]

## کوشتارگەی عاشقان ( ٦ )

قەیسی کوڕی ئەبو حەزم دەڵێت: (دەستی تەڵحەم بە گۆجی بینی، کە لە رۆژی ئوحودا پێغەمبەری خودای پێ پاراستبوو).[2]

## خۆشەویستی لە چاوی دوژمنانەوە

بتپەرستێك نهێنییەکان ئاشکرا دەکات و هەواڵەکان پوخت دەکاتەوە

عوروەی کوڕی مەسعود دەڵێت: خزمینە، سوێند بە خوا من چوومەتە لای پاشاکان، چوومەتە لای قەیسەر و کیسرا و نەجاشی، سوێند بەخوا هیچ پاشایەکم نەدیوە هاوەڵەکانی وەك هاوەڵانی محەممەد بە مەزنی بگرن، سوێند بەخوا کە تفێکی دەکرد دەکەوتە

[1] اخرجه ابن المبارك في كتاب الجهاد، رقم ٩٣.

[2] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، باب اذ همت طائفتان، رقم ٣٨٦١.

لەپی هاوەڵێکەوە تا بە دەموچاو و پێستیدا بهێنێت، کە فەرمانێکی پێدەکردن دەستوبرد جێبەجێیان دەکرد، کە دەستنوێژی دەگرت خەریکبوو لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی بیکەن بە شەڕ، کە قسەی دەکرد دەنگیان لایدا نزم دەکردەوە، ئەوەندە ڕێزیان لێدەگرت بە زەقی سەیریان نەدەکرد.[1]

## سرودی خۆشەویستان

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سبەینێ خەڵکێك دێن بۆ لاتان دڵیان بۆ ئیسلام لە ئێوە نەرمونیانترە، جا ئەشعەرییەکان کە ئەبوموسای ئەشعەریشیان لەگەڵ بوو هاتن، کە لە مەدینە نزیك بوونەوە دەستیان بە گۆرانی وتن کرد و دەیانوت:

**غداً نلقي الأحبة          محمداً وحزبه**

دەڵێت: ئەوان یەکەم کەس بوون ئەملاولا ماچکردنیان داهێنا.[2]

## خۆشەویست کۆچی کرد، ئەی عاشقانی لە دوای ئەو چۆن بوون؟

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە مەدینە هەموو شتێك تیایدا ڕووناك بووەوە، ئەو ڕۆژەش وەفاتی کرد هەموو شتێك تاریك بوو، هێشتا دەستمان لە تۆزی داپۆشینی نەسڕیبوو دڵو دەروونمان لێمان بێزار بوون.[3]

---

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الشروط، باب الشروط في الجهاد، رقم ٢٦٠٣.

[2] اخرجه احمد في مسنده رقم ١٣١٠٠ وقال الألباني ٦٢/٢ اسناده صحيح.

[3] اخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب التأريخ، باب ذكر انكار الصحابة قلوبهم رقم ٦٧٥٢.

## پچڕانی وەحی

ئەنەس دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبوبەکر بە عومەری وت: بڕۆ با بچین بۆ لای دایکی ئەیمەن وەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری لێدەدا، با ئێمەش سەری لێبدەین، کە گەیشتنە لای گریا، وتیان بۆ دەگریت؟ ئەوەی لای خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی باشترە، وتی: بۆ ئەوە ناگریم ئەزانم ئەوەی لای خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی باشترە، بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە وەحی لە ئاسمانەوە پچڕا، جا ئەوانیشی کردە گریان و دەستیان بە گریان کرد.[1]

## خۆشەویست هەموو شەوێك

موسەنای کوڕی سەعید دەڵێت: (گوێم لە ئەنەس بوو دەیوت: هەموو شەوێك لە خەونمدا خۆشەویستەکەم دەبینم)،[2] مەبەستی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

## گەوهەری محەممەدی

کاتێك دوو ڕەگەز یەکیان خۆش دەوێت، دوو مرۆڤ، دوو باڵندە، تەنانەت دوو پەپوولەش، ئەو خۆشەویستیە مەیلی دڵە بۆ دڵ، گیانە بۆ گیان و لکانی جەستەشە بە جەستەوە، ئەمە حاڵەتێکی باوە و کارێکی چاوەڕوانکراوە، بەڵام کاتێك وابەستەیی و خۆشەویستی و مەیل لە دوو

---

[1] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل أم أيمن، رقم ٤٦١٥.

[2] سير أعلام النبلاء، ٤٠٣/٢، وقال الأرناؤوط في تعليقه على السير اخرجه ابن سعد ٢٠/٧ ورجاله ثقات.

ڕەگەزی جیا پەیدا دەبێت، وەك لە نێوان باڵندە و مرۆڤدا یان مرۆڤ و دارێکدا، شتێکی زۆر سەیر دەبێت، هەرچەندە خۆشەویستی سەیری تێدا نییە، چونکە هەرکاتێك رۆحەکان بەیەکگەیشتن و دەروونەکان ئاوێتەبوون، ئیتر خۆشەویستی سەر فرۆ دەکات.

## گەوهەری نۆهەم

ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) رۆژانی هەینی پاڵی دەدا بە بنە درەختێکەوە یان دارخورمایەکەوە، جا ژنێکی ئەنصاری یان پیاوێك، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ میمبەرێکت بۆ دروست نەکەین؟ فەرمووی: بە کەیفی ئێوە، جا میمبەرێکیان بۆ دروستکرد، کە رۆژی هەینی هات، چووە لای میمبەرەکە، کەچی دارخورماکە وەك منداڵ زیراندی، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی و باوەشی پێدا کرد، ئەویش وەك منداڵ کە ئاشت دەبێتەوە، ئای ئایەکی کرد، دەڵێت: گریانەکەی بۆ ئەو هەموو زیکرە بوو کە لایدا دەکرا.[1]

فيا جامداً معنىً بصورة عاقل　　أما لك من قلب شهيد ولا سمع
يحن اليه الجذع شوقاً وما لنا　　السنا بذاك الشوق أولى من الجذع

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح، في كتاب المناقب، باب علامات النبوة في الاسلام، رقم ٣٤١٧.

سەفوانی کوڕی عەسال دەڵێت: کابرایەکی دەشتەکی دەنگ بەرز هاتو وتی: ئەی محەممەد پیاوێك خەڵكێكی خۆشبوێتو پێیان نەگات؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مرۆڤ لەگەڵ کەسێکدا دەبێت کە خۆشیویستووە.[1]

## نۆهەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو: خۆشەویستییە

﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ (الأحزاب : ٦).

واتە: ئەو لە خۆیان لەپێشترە بۆ هەموو کاروباری دینو دنیا، کەواتە پێویستە گوێڕایەڵیی پێش حەزی دەروونی و دوای ئارەزووی خۆیان بخەن.[2]

---

[1] اخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح، ابواب الزهد، باب ما جاء ان المرء مع من أحب، رقم ٢٣٩٦، وقال: حديث حسن صحيح.

[2] زبدة التفسير للأشقر، ل٥٤٩.

# بەشی دەهەم
# دەستلێخشاندنێکی بەسۆز
# لە فەرهەنگی مرۆییدا

دەستی خۆشەویست (ﷺ) خۆشی و شیفابەخشە، بەر جەستەی دۆستو دوژمن کەوتووە، کەبووەتە هەڵگری خۆشەویستی لە ناخیاندا، نەرمونیانی لە جومگەکانیاندا قوڵپەی دەکرد، بۆیە لەبەردەم ئەو هەستە راستەقینە و دەستە فێنکەدا خۆیان نەدەگرت، جگە لەوەی ملکەچی پێغەمبەری بەرەحمەتی موسڵمانان یان تەوبەکاران بن.

## سپیه کەشخەکە

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەزڵی کوڕی عەباسی لە پاشکۆی خۆی سوارکردبوو، کاتێك دەرچوون گەشتنە پۆلێك ژن، فەزڵ دەستی کرد بە سەیرکردنیان، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خستە سەر روومەتی فەزڵ، کەچی فەزڵ رووی بەودیودا وەرگێڕا و سەیری دەکردن، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەستی خستە سەر ئەولای روومەتی فەزڵ، ئەویش رووی بەو دیوا وەرگێڕایەوە و سەیری دەکردن.[1]

## خوێندنەوەی دەقەکە

لەو دیمەنەی دیمان، پێغەمبەر (ﷺ) سواری هێسترەکەیەتی و لە گەشتی پەرستش‌و حەجدایە، مەزنیی مەنزڵەکە و پیرۆزی پلەوپایەی خۆی نەبوونەتە رێگر بۆ ئەوەی تێکەڵی لاوانی ئیسلام بکات و گرێبەستی هاوڕێیەتیان لەگەڵ ئەنجام بدات، بەو شێوەیە لێیانەوە نزیك بێت کە فەزڵی کوڕی عەباسی لە پاشکۆی خۆیەوە سواری هێسترەکەی بکات، فەزڵیش ئەو لاوە کەشخە و قەشەنگە، قژی جوان و رەنگ سپی و سۆڵە.

پێغەمبەر (ﷺ) لە موزدەلیفەوە دەردەچێت و ئەو هاوڕێ لاوەی لەگەڵیدایە، کۆمەڵە ژنێکی خاوێن بە ئیحرامەوە بەلایدا تێدەپەڕن، بە ئیحرام بەستنیان روخساریان هێندەی تر دەدرەوشێنەوە، لەو شیو و

---

[1] اخرجه مسلم في صحيحه رقم ١٢١٨.

دۆلانەی مەککەوە هاتوون بەتەمای خوارزییکردن وحەج قبولْ بوونن، کاروانی رێبوارانی پێشینە راساڵەکان دووبارە دەکەنەوە: ﴿قَالَ هُمْ أُولَاء عَلَى أَثَرِي وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَى﴾ (طه: ٨٤).

رەنگە ویستبێتیان بەو خێرا رۆشتنە زوو بگەنە (مینا) بەر لە حاجییەکانی دی، بەئومێدی تێکەڵنەبوون و نەکەوتنە قەرەباڵغی و نارەحەتی، رەنگیش بەو خێرایی رۆشتنەیان هەندێك شوێنیان دەرکەوتبێت وەك قۆڵ و قاچیان، ئەم هاوڕێ لاوەشمان خۆی پێناگیرێت و تیلی چاویان تێدەکات و ورد سەیری ئەو دیمەنەیان دەکات. جا سەرکردەی پەروەرێن دەستی موبارەکی لەسەر کوڵمە گەشەکەی دادەنێت و بەهێواشی لایدەدات، بە دەستلێخشاندنێکی پڕ سۆز و نەرمونیان رووی لێیان وەردەگێڕێت، چونکە یەکەم چاو پیاهەڵتەقاندن لەسەری نانووسرێت، بەلام دووهەم سەیرکردنی لەسەرە.

## دڵی کوڕە کەشخەکە تەسلیم دەبێت چاوی مەیلی هەر ماوە

روومەت و گەردنی لەگەڵ دەستی سەرکردەی پەروەرێندا (ﷺ) چەماوە و بەڕواڵەت بڕیارەکەی قبولْ کرد، بەلام دووبارە روومەتی چەماوە چاوی چووەوە سەر کچەکان رەوتیان دەکرد، پێغەمبەری پەروەرێن (ﷺ) هۆشیار و ئاگاداری هاوڕێ گەنجەکەیەتی، دووبارە دەستی موبارەکی بە کوڵمیدا دەکێشێت و لایدەدات، تا رووی لابدات و چارەسەری دڵی بکات.

پەروەردە بەم شێوەیە دەبێت، لێدانێکی نەرمو نیان دووبارە دەکرێتەوە و ئاراستە لە دوای ئاراستە، تا دڵە بێئاگاکان بە ئاگابێنەوە و دەروونە بێهۆشەکان بێنەوە هۆش.

سەرکردەی مەزن (ﷺ) لەم هەڵوێستەدا بە دەستپێداکێشانی پڕسۆزی کوڵمی فەزڵ وازدەهێنێت، ئیتر نە وتاری بۆ دەداو نە ئامۆژگارییشی دەکات.

سەرکردەی مەزن بەوشێوە جۆرەکانی پەروەردەکردن و ڕێگاکانی چاکسازیی دەگۆڕێت، خۆ خەڵك پێنج هەستەوەری هەیە (گوێ قسە دەبیستێ، لوت بۆن هەڵدەمژێت، چاو تەنەکان دەبینێت، زمان شیرینی دەچێژێت، پێستیش لە جەستە دەخشێت)، بۆیە سەرکردەی پەروەرێن (ﷺ) لە بانگەواز و ڕوونکردنەوە و ڕێنموونی چاکەکردندا مەبەستی بوو مۆچیاری جۆراوجۆر بکات و ئاراستەکردن بگۆڕێت، تا هەموو هەستەوەرەکان تێر و چاك بکات و هەقی خۆیان بداتێ.

سەرکردە مەزنەکان ئاوهان، جا چ سەرکردەیەك لە محەممەد (ﷺ) مەزنترە.

## دەهەم نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو: دەستپیاداهێنانێکی نەرم و دەستێکی بەسۆز پایەی دەروونی ئەم نهێنیەی سەرکردایەتی

مرۆڤ کە خودا دروستیکردووە پارچەیەکە لە هەستو شعوور.

مەرج نییە تەنها لە رێگەی بیستنەوە بچینە ناوەوەی دڵ، مرۆڤ بە سروشتی خۆی لە یەك رەنگو یەك بۆ بێزار دەبێت.

کەواتە پێویست بە چێژگۆڕین و جۆراوجۆرکردنی رێچکە دەکات.

هەموو مرۆڤێك کۆمەڵێك پێویستی هەیە، بەپێی پێکهاتە هەستەوەرەکانی و ئەوەی بە سروشتیی لەسەری راهاتووە، کەواتە سیاسەتمەداری تەواو و سەرکردەی چاك ئەوەیە پێویستییەکانی خەڵك بناسێت و لە هۆکارەکانی کاریگەریی گەشتبێت. سەرکردە لەم مانایە گەیشتبوو، بۆیە تەنها لە چوارچێوەی دەربڕینی زمان و ئامۆژگاری و وتارداندا نەدەوەستا، بەڵکو بە هەستەوەرەکانی دیکەشی شوێنکەوتوانی ئاینەکەی تێر دەرکرد، ئەمەشی لە کرۆکی ئەو وەحیە فێر بووبوو کە دادەبەزییە سەری، ئەم سەرکردەیە شێوەکانی رێگای هیدایەتی دەگۆڕی تا خەڵکەکە هەموو پێویستییەکانیان تێر بکەن. رێنوێنیەکانیش هەیانە وەك قورئانی پیرۆز دەبیسترێن یان وەك وتاری هەینی و زانستەکانی دیکە، هەشیانە دەبینرێن وەك رێڕەوی پیاوچاکان و ئاکاری زانا خوداپەرستەکان، تیاشیاندایە وەك پاڵدانەوەکانی یەکتر لە نوێژی جەماعەت، ریزە رێکوپێکەکانی گۆڕەپانی جیهاد و تەوقە و باوەش بەیەکدا کردن و دەستهێنان بەسەری هەتیوو و منداڵدا، ئەمانە بە لێخشاندنە.

بەڵام هەیانە بەتامکردنە، وەك: شەربەتێکی شیرینی ساردی بەتامە، خواردنێکی خۆشی بەلەزەتە، وەك گۆشتی شانو پەراسوو، کولەکە و خواردنە خۆشەکانی دیکە، خودا فەرمانی بە خواردنیان دەکات، یان پێغەمبەری خوا بە رەفتار و گوفتار فەرموویەتی. هەشیانە هەڵیدەمژی وەك بۆنو عەتر و گوڵاو لەو کاتانەی فەرمانی پێکراوە لە رۆشتن بۆ نوێژی هەینی و جەژن و شوێنە گشتییەکان.

بۆیە لە ژیانی ئەم سەرکردەدا جگە وەك: دەربڕینی زمان، هەستەوەرەکانی دیکەش وەك دەستلێخشاندنو باوەشپێداکردن دووبارەبوونەتەوە، ئەمەش چەپکە گوڵێکە لەو گوڵزارە کە لە شوێنی جیاوازی شەڕ و ئاشتی، گەمەو گاڵتە و حاڵەتی ئاساییدا دووبارە بووەتەوە. اللهم صل على محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

## دەستە موبارەکەکانی لێخشاندنێکی ئاوریشمیانە

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) رەنگێکی گەشی هەبوو دەمارەکانی وەك یاقووت دەردەکەوتن، کە بەڕێوە دەڕۆیشت، لەشو لاری رێك دەوەستا، دەستم لە هیچ ئاوریشم و کەتانێك نەداوە لە لەپی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەرمتر بێت، بۆنی هیچ میسك و گوڵاوێکیشم نەکردووە خۆشتر بێت لە بۆنی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[1]

[1] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل، باب طيب رائحة رسول الله (ﷺ)، رقم ٤٤٢٠.

## بۆنی گوڵاو و پەنجەی گوڵوەچەن

جابری کوڕی سەمرە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم نوێژمکرد، پاشان چووەدەر بەرەو ماڵ، منیش لەگەڵی چوومە دەر، دوو کوڕ بەرەو پیری هاتن، ئەویش یەك یەك دەستی دەهێنا بە کوڵمیاندا، دەڵێت: دەستیشی بەسەر کوڵمی مندا هێنا، لە دەستەکانییەوە فێنکی و بۆنێکم پێگەشت وەك لە قوتووی عەتار دەریهێنابێت وابوو.[1]

ئەم دەستە ناسكو نەرمو بۆخۆشە، کە لە جەستەی دۆستو دوژمن دەخشان دەگۆڕا بە خۆشەویستییەکی دەروونیی، نەرمونیانییەك بە هەموو دەمارەکاندا دەهات و دەچوو، بۆیە لە بەردەم ئەم هەستە راستگۆیانە و ئەو دەستە فێنکەدا جگە لە ملکەچبوون بۆ پەیامبەری رەحمەت هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو.

## ئەو شەرەفەیان بەرکەوت

زۆر کەس شەرەفی ئەو دەستلێخشانەیان بەرکەوت بە دەستە پڕ سۆزە تووشی سەرفرازی بوون، ئێمە سیانیان بە نموونە دەهێنینەوە:

١ـ نەوجەوانێك مۆڵەتی تاوانکردن دەخوازێت.

٢ـ فوزالەی کوڕی عەمری لەیسی.

٣ـ شەیبەی کوڕی عوسمان.

---

[1] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الفضائل، باب طيب رائحة رسول الله (ﷺ)، رقم ٤٤١٨.

## ئەو نەوجەوانەی دەستی خستە سەر سنگی

ئەبو ئومامە دەڵێت: لاوێکی تازەپێگەیشتوو هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتی زیناکردنم پێ بدە، ـ دوای گفتوگۆیەك کە لە سەرەتای فەسڵی چوارەمدا هێناومانە ـ پێغەمبەر (ﷺ) دەستی خستە سەری و فەرمووی: خودایە لە گوناهی خۆشبە و دڵی خاوێن بکە و ناموسی بپارێزە. ئەنجامی ئەم دەستخستنە سەر سنگە بە سۆزە ئەوەبوو (دوای ئەوە ئەم لاوە ئاوڕی لە هیچ نەدەدایەوە).[١]

## فوزالە (دەستی خستە سەر سنگم)

فوزالەی کوڕی عومەیری لەیسی دەڵێت: (ساڵی فەتحکردنی مەککە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە خەریکی تەوافکردن بوو بە دەروی کەعبەدا، دەمویست بیکوژم، کە لێوەی نزیکبوومەوە فەرمووی: ئەوە فوزالەی؟ وتم: بەڵێ، فوزالەم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: چیت لە دڵی خۆتدا دەوت: وتم: هیچ خەریکی یادی خودا بووم، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی پێم: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە، پاشان دەستی خستە سەر سنگم).

ئەنجامی ئەم دەستخستنە سەر سنگە بەسۆزە لەسەر فوزالە دەڵێت: (سوێند بەخوا دەستی بەرزنەکردەوە تا بوو بە خۆشەویستترین دروستکراوی خودا لە دڵمدا).[٢]

---

[١] اخرجه الامام أحمد في مسنده، مسند الأنصار، رقم ٢١٦٧٦.

[٢] انظر الاصابة لابن رجب، مجلد/٨، رقم ٦٩٩٨.

## شەیبە (دەستیهێنا بە سنگمدا)

شەیبەی کوڕی عوسمان دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) غەزای حونەینی کرد، باوکم و مامم بیرکەوتەوە کە عەلی و حەمزە کوشتبوونیان، وتم: ئەمڕۆ تۆڵەی خۆم لە محەممەد دەکەمەوە، جا رۆشتم بۆی، دەبینم عەباس بە لای راستییەوە و قەڵغانێکی سپی وەك زیوێك رەشەبا تەپوتۆزی پێوە نەهێشتبێت پێ بوو، وتم: مامیەتی دەستبەرداری نابێت، لای چەپەوە بۆی چووم، ئەبو سوفیانی کوڕی حارسیش لای چەپیەوە بوو، وتم: ئامۆزایەتی دەستبەرداری نابێت، لە دواوە بۆی چووم، نزیکبوومەوە، نزیکبوومەوە، تا ئەوەندەی بەشی شمێروەشاندنم مابوو، کەچی بزیسکەیەکی ئاگرم بۆ هات وەك هەورە بروسکە وەها بوو، ترسام بمسوتێنێت، بۆیە پاشەوپاش گەڕامەوە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لایکردەوە بۆم و فەرمووی: شەیبە وەرە، دەستی خستە سەر سنگم، تا خودا شەیتانی لەدڵ دەرکردم.

ئەنجامی ئەم دەستە خستنە سەر سنگە:

شەیبە دەڵێت: (چاوم بۆ بەرزکردەوە، ئا لەو کاتەدا ئەو لە گوێو چاوم‌و چیو چی خۆشەویستتر بوو لام، پێی وتم: ئەی شەیبە کافران بکوژە).[1]

---

[1] اخرجه الطبراني في مالعجم الكبير رقم ٧٠٢٨ قال الهيثمي وفيه ابوبكر الهندلي وهو ضعيف، واخرجه البيهقي في دلائل النبوة ١٤٥/٥ وقال له شاهد.

## له سنگم‌و پشتم

عوسمانی کوڕی عاس ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) پێی وتم: پێشنوێژی خزمانت بکه‌، وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا شتێك له‌ دڵمدایه‌، فه‌رمووی: نزیکی که‌نه‌وه‌، ئیتر له‌به‌رده‌ستیدا دایاننام، پاشان له‌پی خسته‌ سه‌ر سنگم (نێوان مه‌مکه‌کانم)، پاشان فه‌رمووی: روو وه‌رگێڕه‌، پاشان خستییه‌ سه‌ر پشتم نێوان دوو شانم، جا فه‌رمووی: پێشنوێژی خزمانت بکه‌، هه‌رکه‌سێکیش پێشنوێژی بۆ خه‌ڵکێك کرد با نوێژێکی کورت بکات، چونکه‌ پیر و نه‌خۆش‌و لاوازو خاوه‌ن پێداویستیان تێدایه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر به‌ ته‌نها نوێژتان کرد، چونتان ویست به‌و شێوه‌یه‌ نوێژ بکه‌ن).[1]

## گوێچکه‌ پرواندن

عه‌بدوڵڵای کوڕی عه‌باس ده‌ڵێت: لای مه‌یمونه‌ی پوورم خه‌وتم، وتم: سوێند بێت سه‌رنجی نوێژکردنی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) بده‌م، فه‌رشێکیان بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) راخست، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌ درێژی له‌سه‌ری خه‌وت، پاشان ده‌ستی به‌ چاویدا هێنا تا خه‌وی له‌ چاوی تاراند، پاشان ده‌ ئایه‌تی کۆتایی ئالی عیمرانی خوێند، تا خه‌تمی کرد، پاشان مه‌سینه‌یه‌ك هه‌ڵواسرابوو بردی و ده‌ستنوێژی گرت، پاشان ده‌ستی به‌ نوێژکردن کرد، منیش هه‌ستام وه‌ك ئه‌وم کرد و هاتم له‌ ته‌نیشتیدا وه‌ستام، ئه‌ویش ده‌ستی خسته‌ سه‌ر سه‌رم‌و پاشان گوێی

[1] اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الصلاة، باب امر الأئمة بتخفيف الصلاة رقم ٧٥٤.

گرتم و رایکێشا، دوایی دوو رکعەت نوێژی کرد، دوایی دوو رکعەتی تر، دوایی دوو رکعەتی تر دوایی دوو رکعەتی تر، دوایی دوو رکعەتی تر، دوایی دوو رکعەتی تر، دوایی وەتری کرد.[1]

## دەستی بەسەرمدا هێنا

سائیبی کوڕی یەزید دەڵێت: پورم بردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم خوشکەزامە نەخۆش کەوتووە، ئەویش دەستی هێنا بەسەرمدا، دوعای بەرەکەتداری بۆ کردم، دوایی دەستنوێژی گرتو منیش لە ئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، پاشان چوومە دوای پشتیەوە سەرنجی مۆری پێغەمبەرایەتییەکەیمدا لە نێوان هەردوو شانیدا.[2]

## زانستت پیرۆز بێت

ئەبو سەلیل دەڵێت: کابرایەکی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەی بۆ خەڵك دەگێڕایەوە، تا خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، جا چووە سەربانی ماڵێك و فەرموودەی دەگێڕایەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: چ ئایەتێك لە قورئاندا لە هەموو مەزنترە؟ وتی: پیاوێك وتی: الله لا اله الا هو الحي القيوم، وتی: جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خستە نێوان دوو شانم، تا هەستم بە فێنکی کرد لە نێوان دوو مەمکمدا، یان وتی: دەستی خستە نێوان دوو مەمکم، فێنکیەکەیم لە نێو شانمدا هەست پێکرد، فەرمووی: ئەی ئەبو مونزیر زانست زانستت پیرۆزە.[3]

---

[1] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب التفسير باب (الذين يذكرون الله..... )، رقم ٤٣١٢.

[2] اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، باب ختم النبوة، رقم ٣٣٧٥.

[3] اخرجه الامام أحمد في مسنده، أول مسند البصريين، رقم ٢٠١١٩.

## قورئانی بیر دەچووەوە

عوسمانی کوڕی ئەبو عاس دەڵێت: لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵای بیرچوونەوەی خۆمم کرد بۆ قورئان لەبەرکردن، فەرمووی: ئەوە شەیتانێك بیرت دەباتەوە خەنزەبی پێ دەڵێن، عوسمان لێم نزیك بەرەوە، پاشان دەستی خستە سەر سنگم، لەناو شانمەوە هەستم بە فێنکایەتی دەکرد، پاشان فەرمووی: شەیتان لە سنگی عوسمانی دەرچۆ، دوای ئەوە هەرچیم دەبیست لەبەرم دەکرد.[1]

## دەستلێدانێکی پزیشکانە

ئەبیەزی کوڕی حەمال دەڵێت: دەموچاوی دومەڵێکی لێ دەرهاتبوو، گەشتبووە لووتی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد و دەستی هێنا بە روخساریدا، ئیتر تا ئێوارە نەما، بەڵام جێگاکەی دیاربوو.[2]

## دەستی بەسەرمدا هێنا

عەمری کوڕی حورەیسی میسری دەڵێت: دایکم بردمی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش دەستی بەسەرمدا هێنا و دوعای زیادبوونی رۆزی بۆ کردم.

---

[1] اخرجه البهقي في دلائل النبوة، جماع ابواب غزوة تبوك رقم ٢٠٤٨.

[2] اخرجه ابو نعيم الأصبهاني في دلائل النبوة، باب القول فيما اوتي عيسى رقم ٥٤٤.

## دوو نەوموسڵمان

ئەبو عبەدوڕەحمانی جوهەنی دەڵێت: ئێمە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا بووین دوو سوار دەرکەوتن، کە بینینی، فەرمووی: هۆزی کیندی و موزحجین، کە گەشتن دەبینن موزحجین ، دەڵێت: یەکێکیان لێی نزیك بووەوە تا بەیعەتی بداتێ، کاتێك دەستی گرت وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێك بت بینێت و باوەڕت پێ بهێنێت و بەراستت دابنێت و شوێنت بکەوێت چی بۆ هەیە؟ فەرمووی: مژدە بێ لێی، جا دەستی بەسەر دەستیدا هێناو لاچوو، پاشان ئەوی دی هات تا دەستی گرت بۆ ئەوەی بەیعەتی بداتێ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا یەکێك باوەڕت پێ بهێنێت و بەڕاستت بزانێت و شوێنت کەوێت، بەڵام نەتبینێت؟ فەرمووی: مژدە بێت بۆی، پاشان مژدە بێت بۆی، پاشان مژدە بێت لێی، پاشان مژدەبێت لێی دەڵێت: دەستی بەسەر دەستیدا هێنا و لاچوو.[1]

## گەوهەرێکی محەممەدی

مەسەلەکە تەنها بەدەستلێدان لە سنگی سەرکەوتووان و کوڵمی خۆشەویستان نەوەستاوە، بەڵکو لەگەڵ نزیکایەتی لەوەش تێدەپەڕی بۆ باوەشپێداکردن و ئەملاولا ماچکردن، جا توخوا ئەمە چ سەرکردە و مرۆڤێکە، بەراستی نەوەی یەکەم کە شەرەفی گەیشتن بە پێغەمبەریان پێبڕا، سەرفراز بوون، سەرفرازییەك هیچ سەرفرازییەك نایگرێتەوە،

---

[1] اخرجه الامام احمد في مسنده، مسند الشاميين، رقم ١٧٠٨٤.

چونکە شەرەفی هاوەڵبوون هیچ شەرەفێکی دیکە نایگاتێ، سەیری ئەو نەوە بکە چۆن دەرچوون، واتە ئەو نەوەیەی کە لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەروەردە بوون.

راستیەکەی نەوەی هاوەڵان بە درێژایی رۆژگار تێر و تەواوترین نەوەبوون، هەر هاوەڵێك خۆی بە تەنها حاڵەتێکی تایبەت بوو، هەریەکەیان پشکی بەشێکی سەروەریەکانی بەرکەوتووە، هێزی ئەوانیش لە هێزی سەرکردەکەیانەوەیە. دەخوایە درووود و رەحمەتت بنێرە بۆ سەر محەممەد و خێزان و نەوەکانی وەك درووود و رەحمەتت نارد بۆ سەر ئیبراهیم و خێزان و نەوەکانی.

## گەوهەری دەهەم

## عەبدوڵڵای کوڕی عەباس سەرکەوت

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا گوشیمی بەخۆیەوە و فەرمووی: خودایە قورئانی فێر بکە.[1]

[1] رواه البخاري في كتاب العلم، باب قول النبي (ﷺ): اللهم علمه. رقم ٧٥.

## دەهەم هونەری سەرکردەی سەرکەوتوو:

## دەستپێداهێنانێکی نەرم و دەستێکی بەسۆز

جا ئەی سەرکردە با تۆش خاوەن دەستلێدانێکی نەرمو دەستێکی بەسۆز بیت.

﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (التوبة : ١٢٨).

(لَقَدْ جَاءكُمْ) دواندنی هەموو خەڵکە بە عەرەب و عەجەمەوە.

(رَسُولٌ) خودا بۆ کارێکی مەزن بۆی ناردووە.

(مِّنْ أَنفُسِكُمْ) لە رەگەزی ئادەمیزادە.

(عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ) نارەحەتی ئێوەی لەسەر سەختە.

(حَرِيصٌ عَلَيْكُم) پەرۆشە بۆ باوەڕەکەتان.

(بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) بەبەزەیی و نیانە لەگەڵ باوەڕداران.(١)

---

١ زبدة التفسير للأشقر، ل٢٦٤ بتصرف.

## ده نهێنی سەرکردەی سەرکەوتوو

١ـ بەخشینی رێزو بایەخدان بە هەموو کەسێك.

٢ـ لۆمەنەکردن و خۆلادان لە رەخنەگرتن.

٣ـ ناوزانین و بەخشینی نازناو و سیفەتی جوان.

٤ـ گفتوگۆی جوانو نەرمو گوێگرتن.

٥ـ زەردەخەنەیەکی پرشنگدارو دەروونێکی کراوە.

٦ـ گەمەو گاڵتەیەکی کەم و گەپێکی بە لوتف.

٧ـ هاوسەرێکی مەزن.

٨ـ منداڵێکی مەزن.

٩ـ خۆشەویستیەکی زۆر و تۆوێکی راساڵ.

١٠ـ دەستێکی بەسۆز بەیەك دوو جار لێخشاندن.

# کۆتایی

سوپاس بۆ ئەو خودایەی یارمەتیداین لە سەرەتاوە تا کۆتایی.

خێر هەر لە ئەوەوەیە و هەر بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە.

بیرۆکەی ئەم نووسینە وتارێکبوو لە مزگەوتێکدا پێشکەشمکرد، سەبارەت بە مامەڵەی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەو ئافرەتەی کە خزمەتی مزگەوتی دەکرد، کەچی وەك دەبینیت ئەم هەموو لاپەڕەی تێپەڕاند، کەواتە سەد شوکر و سەنا بۆ باری تەعالا.

جا ئەمە ئەگەر مانایەکی هەبێت، مانای گەورەیی دینەکە دەگەیەنێت. لەم نووسینەدا هەوڵمداوە نهێنییەکانی سەرکردایەتییکردنی سەرکەوتووانەی محەممەدی دەربخەم، کە لە ماوەی بیست ساڵدا ئەوەی ئەو کردی هیچ پەیامبەرێکی بەڕێز و سەرکردەیەکی مەزن نەیکردووە.

هەوڵیشمداوە ئەوە روون بکەمەوە کە چۆن ئەم سەرکردە مەزنە لەو ماوە کورتەدا توانی هۆش‌و دڵەکان کەمەندکێش بکات و بەرەو ئامانجێکی دیاریکراویان ببات.

تەنها لە بیست‌و سێ ساڵدا بزانە ئەم سەرکردە مەزنە (ﷺ) چی کرد؟

## کەواتە ئەو نهێنیانە چین؟

بێگومان ئەم نووسینە هەموو نهێنیەکانی دەرنەخستووە، تەنانەت ئەگەر کۆمەڵێك نووسەر هەموو ژیانیان تەرخان بکەن بۆ قووڵبوونەوە لە دۆزینەوەی نهێنییەکان بە تەواوی بۆیان نادۆزرێتەوە.

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کانیەکی نەسروەت و رووبارێکی نەوەستاوە و وشك ناکات، دەریایەکە چەندی لیٚ هەڵگۆزیت کەمناکات.

هەرچی قسەی هەیە بۆمان گێڕڕاوەتەوە، هەموو هەڵس و کەوتەکانیمان بۆ گوێزراوەتەوە، ئەوەی ویستوویەتی و ئەوەی نەیویستوە، ئەوەی حەزی لێبوەو ئەوەی حەزی لێی نەبووە، باسی رەنگگۆڕانی رووخسار، شێوەی زەردەخەنەی، رەنگی زمانی، درەخشانی ددانی و کاتی دەرکەوتنیان هەموویمان بۆ گێڕراوەتەوە.

ئازاری نەخۆشیەکانی و پلەی هێز و ئارامیمان پێگەیشتووەتەوە.

دەزانین: چۆنی دەخوارد و چۆنی دەخواردەوە، چی دەخوارد، چۆن دەخەوت، لەسەرچی دەخەوت، چۆن هەڵدەستا لە خەو، کەی نەدەخەوت، چۆن لە ماڵەکەیدا نوێژی دەکرد، لە فەرزەکاندا چی دەخوێند ئەی لە سوننەتەکاندا، چی بە هاوسەرەکانی دەوت، کە لە ماڵەوە بوو چۆن چۆنی دەکرد، ئەو جۆرە ئیشانە چیبوو لە ماڵ دەیکرد.

هەموو ئەمانە و لەمانەش زیاتر بە روونی بێگریٚ و گۆڵ لە زیاتر لە کەسێکەوە بۆ ئێمە گێڕراوەتەوە، جا کەواتە ئایا بە منو نموونەی من چۆن هەموو ئەو نهێنیانەی دەرك دەکەن، نە بەخوا.

دەی "اللهم صل على محمد وأزواجه وزريته كما صليت على ابراهيم وبارك على محمد وأزواجه وذريته كما باركت على ابراهيم انك حميد مجيد".

ئەگەر دەتەوێت سەرکردەیەکی مەزنت لێدەرچێت، ئاگاداری ئەم دە بنەمایە بە:

١ـ بایەخی پێویست بە هەموان بدە و رێزیان بۆ دەرخە و ستایشیان بکە.

٢ـ خۆت لە رەخنەی رووخێنەر ببوێرە و سەرزەنشتی خۆشەویستانت مەکە.

٣ـ نازناوی جوان ببەخشە، خۆشەویستانت بەسیفەتی شیرین بانگ بکە.

٤ـ گوێگرێکی باش بە، گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانیتردا بە قەناعەت بکە.

٥ـ حاڵت هەرچۆنێکە بەردەوام دەم بە خەندە بە.

٦ـ گەپێکی کەمی خۆشت هەبێت لە جێگەی خۆیدا خەڵك پێی خۆشە ستایش دەکرێیت.

٧ـ خۆشەویستی لە ماڵەکەتدا بڵاوکەرەوە و راوێژ بە هاوسەرەکەت بکە و لە هەڵەکان خۆشبە لە وەختی دەسەڵاتدا بە نەرمی هەڵسوکەوت بکە.

٨ـ جارجار دابەزە بۆ ئاستی منداڵەکانت و ئەوانیش بۆ لای خۆت بەرز بکەرەوە.

٩ـ تۆوی خۆشەویستی بڵاوبکەرەوە و دەنکی سۆز بڕوێنە.

١٠ـ با دەستلێدانێکی نەرمو دەستێکی بەسۆزت هەبێت.